حکومەتی هــەرێمی کوردستان - عێراق
وەزارەتی خـوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی
زانکـۆی سلێمانی
کۆلیژی پەروەردەی بنەڕەت
بـەشـی باخچەی منداڵان

# کاریگەریی چیرۆك لە گەشەپێدانی بەها ئاکارییەکان لای منداڵانی باخچە

نامەیەکە پێشکەش بە ئەنجوومەنی کۆلێجی پەروەردەی بنەڕەتی زانکۆی سلێمانی کراوە وەک بەشێک لە پێداویستییەکانی بەدەستهێنانی بڕوانامەی ماستەر لە باخچەی منداڵان

لەلایەن
هێرۆ عبدالله حسین

بەسەپەرشتی
پ. د. نیان نامق صابر

2723 کوردی    2023 زاینی    1444 کۆچی

بسم الله الرحمن الرحيم

# (لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي الْأَلْبَابِ)

**صَدقَ اللهُ العَظِيم**

سورة يوسف: الاية (111)

## بڕیاری سەرپەرشتیار

ئەم نامەیە بەناونیشانی(کاریگەریی چیرۆك لە گەشەپێدانی بەها ئاکارییەکان لای منداڵانی باخچە) بەسەرپەرشتی و لەژێر چاودێری مندا لەلایەن خوێندکاری ماستەر (هێرۆ عبداللە حسین) لەزانکۆی سلێمانی کۆلێجی پەروەردەی بنەڕەت، ئامادەکراوە، بەشێکە لەپێداویستیەکانی بەدەستهێنانی بڕوانامەی ماستەر لەبواری باخچەی منداڵان، لەوپێناوەدا واژۆمان کردووە.

واژۆ

پ. د. نیان نامق صابر

سەرپەرشتیار

ڕێکەوت: / /

بەپێی ئەم پێشنیازانە ئەم نامەیە پێشکەش لیژنەی هەڵسەنگاندن دەکەم.

واژۆ

ناو: پ . د. صابر بکر مصطفی

سەرۆک بەشی باخچەی منداڵان

## بڕیاری هەڵسەنگاندنی زانستی

ئەم توێژینەوەیە بە ناونیشانی (**کاریگەریی چیرۆك لە گەشەپێدانی بەها ئاکارییەکان لای منداڵانی باخچە**) ئەرکی پێداچوونەوە و وردبینیکردنی زانستی بە من سپێردرا، دوای سەرنجدان دەرکەوت، هەڵەو گوزارشتی زانستی نادروستی تێدا نیە، لەبەرئەوە واژوومکرد.

هەڵسەنگاندنی زانستی

واژوو:

ناو:

بەروار: / / 2023

## بڕیاری هەڵسەنگاندنی زمانەوانی

ئەم توێژینەوەیە بە ناونیشانی (**کاریگەریی چیرۆك لە گەشەپێدانی بەها ئاکارییەکان لای منداڵانی باخچە**) ئەرکی پێداچوونەوە و وردبینیکردنی زمانەوانی بە من سپێردرا، دوای سەرنجدان دەرکەوت، هەڵەو گوزارشتی زمانەوانی نادروستی تێدا نیە، لەبەرئەوە واژوومکرد.

هەڵسەنگاندنی زمانەوانی

واژوو:

ناو:

بەروار:    /    /2023

## بڕیاری لیژنەی گفتوگۆ

ئێمە ئەندامانی لیژنەی گفتوگۆ و هەڵسەنگاندن، ئەم نامەیەمان بەناونیشانی(**کاریگەریی چیرۆك لە گەشەپێدانی بەها ئاکارییەکان لای منداڵانی باخچە**) لەگەڵ خوێندکاری ماستەر (**هێرۆ عبدالله حسین**) گفتوگۆمان دەربارەی ناوەڕۆک و لایەنەکانی دیکەی کرد و بڕیارماندا کە شایستەی ئەوەیە بەپلەی ( ) بڕوانامەی ماستەر لە ( باخچەی منداڵان) پێبدرێت، لەو پێناوەدا واژۆمان کردووە.

| | |
|---|---|
| واژۆ | واژۆ |
| ناو: | ناو: |
| ئەندام | ئەندام |
| ڕێکەوت: / / | ڕێکەوت: / / |

| | |
|---|---|
| واژۆ | واژۆ |
| ناو: | ناو: |
| ئەندام | ئەندام |
| ڕێکەوت: / / | ڕێکەوت: / / |

لەکۆبونەوەی ئەنجومەنی کۆلێجی پەروەردەی بنەڕەتی ژمارە ( )
لەڕێکەوتی( / / ) پەسەندکرا .

واژۆ

ناو: پ . د. حسن فخرالدین خالد

ڕاگری کۆلێجی پەروەردەی بنەڕەت/ بەوەکالەت

ڕێکەوت: / /

**پێشکەشە:**

- سەرپەشتیاری ئازیز (پ.د. نیان نامق صابر) کە هەمیشـە نموونەیـەکی جـوان و باڵا بوە لە زانست و رەوشت و نەرم و نیانی.
- باوك و دایکی ئازیز و خوشك و براکانم، کە هەمیشە جێگەی شانازی و خۆش بەختی بون بۆم و هێزیان پێ بەخشیووم.
- هاوسەر و منداڵە خۆشەویستەکانم، کە سەرچاوەی گەشبینین لە ژیانم.
- کۆلیژی پەروردەی بنەڕەت/ زانکۆی سلێمانی.
- هاوڕێیان و زانست دۆستان.
- سەرجەم منداڵأنی ئاستی دووی باخچەی منداڵان.

هێرۆ

**سوپاس و پێزانین**

- سەرەتا سوپاس بۆخودای هەمیشە زیندوو بەئاگا.
- سوپاسی بێپایانم بۆ سەرپەرشتیاری بەڕێز (پ.د. نیان نامق صابر). کە ڕێنیشاندەرم بو لە هەنگاوە زانستیەکانی توێژینەوەکە.
- سوپاس و پێزانینم بۆ زۆر بەڕێز (پ.د.سابیر بەکر) سەرۆک بەشی باخچەی منداڵان هەروەها ڕاگرایەتی کۆلیژی پەروەردەی بنەڕەت.
- سوپاس و پێزانینم بۆ کارمەندان و بەڕێوەبەری باخچەی منداڵانی کازیوە.
- سوپاس بۆ خانەوادەکەم، بە تایبەت برای ئەزیزم (م. هیوا عبداللە حسین و هێمن عبداللە حسین).
- سوپاس بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە هاوکارمبون و کارئاسانییان بۆ کردوم لە هەر قۆناغێکی توێژینەوەکەدا.

هێرۆ

# پوختەی توێژینەوە

ئامـانجی توێژینەوەکـە بریتیـە لـە (زانینـی کاریگـەریی چیـرۆك لـە گەشـەپێدانی بـەها ئاکارییەکان لای منداڵانی باخچە ئاستی دووەم تەمەن(5ساڵ) ، توێژەر بۆ گەیشتن بە ئامانجی توێژینەوەکـەی میتـۆدی (ئـەزموونی) بـەکارهێناوە، کـە لەگـەڵ نـاوەڕۆکی توێژینەوەکەیـدا گونجاوە، ئامرازی توێژینەوەکە بریتیە لە پێوەری بـەها ئاکارییـەکان پێکهـاتووە لـە (5) بـوار و ئامـادەکردنی چیرۆکـەکانی تایبـەت بـە بـواری بـەها ئاکارییـەکان کـە بـریتین لـە (7) چیـرۆك، کۆمەڵگەی توێژینەوەکە بریتیە لە منداڵانی باخچە، نموونـەی توێژینەوەکـەش بریتیـە لـە (40) منداڵی باخچە کە دابەشکراون بەسـەر دوو گروپـدا گروپـی ئـەزموونی (20) منـداڵ و گروپـی کـۆنترۆڵکراو (20) منـداڵ، تـوێژەر ئـامرازە ئامارییـەکانی (t-test ) هاوکۆلکـەی پەیوەنـدی پێرسۆن، (One Way ANOVA)،(بەراوردکاری فرەیی) (LSD) بەکارهێناوە و گەیشتە چەند دەرەنجامێك کە بریتین لە:

1. جیاوازی نێوان ئاستی پێوەرەکانی توێژینەوەکە بۆ تاقیکردنەوەی پێشەکی و پاشـەکی بـۆ گروپـی ئـەزموونی سـەبارەت بـە بوارەکـانی (دەسـتپاکی، یـارمەتی، گـوێڕایەڵی، میهرەبـانی، پارێزگـاریکردن) لـە بەرژەوەنـدی تاقیکردنـەوەی پاشـەکییە لـە گێڕانـەوەی چیرۆك لە گەشەپێدانی بەهاکان لای منداڵانی باخچە.
2. جیاوازی ئاستی ئاماریی بەدیناکرێت لە خوێندنەوەی چیرۆك بۆ گروپی ئـەزموونی لـە گـۆڕاوی تەمـەن، ئـەوەش ئـەوە دەردەخـات کـە لـەڕووی تەمەنـەوە هاوتـان لـە پـاش گێڕانەوەی چیرۆك لە گروپی ئەزموونی.
3. جیاوازی ئاستی ئاماریی بەدیناکرێت لە خوێندنەوەی چیرۆك بـۆ گروپـی ئـەزموونی لـە گۆڕاوی ڕیزبەنـدی، ئـەوەش ئـەوە دەردەخـات کـە لـەڕووی ڕیزبەنـدی هاوتـان لـە پـاش گێڕانەوەی چیرۆك لە گروپی ئەزموونی.
4. جیاوازی ئاستی ئاماریی بەدیناکرێت لە خوێندنەوەی چیرۆك بـۆ گروپـی ئـەزموونی لـە گـۆڕاوی ڕەگـەز، ئـەوەش ئـەوە دەردەخـات کـە لـەڕووی ڕەگـەزەوە هاوتـان لـە پـاش گێڕانەوەی چیرۆك لە گروپی ئەزموونی.
5. گێڕانەوەی چیرۆك کاریگەریی هەیە لەسـەر منـداڵان بـۆ بـەهای ئاکـاریی، ئـەویش دوای ئەنجامدانی ئەزمونەکەو گێڕانەوەی چیرۆك بۆ گروپی ئەزموونی.

## پێڕستی ناوەڕۆك

# پێڕستی خشتەکان

# پێڕستی پاشکۆکان

# بەشی یەکەم

# ناساندنی توێژینەوەکە

**1-1 کێشەی توێژینەوەکە**

**2-1 گرنگی توێژینەوەکە**

**3-1 ئامانجی توێژینەوە**

**4-1 گریمانەی توێژینەوەکە**

**5-1 سنوری توێژینەوە**

**6-1 پێناسەی چەمك و زاراوەکان**

## بەشی یەکەم

## ناساندنی توێژینەوەکە

**1-1 کێشەی توێژینەوەکە:**

قۆناغی سەرەتای منداڵی، قۆناغێکی دیارو هەستیاری گەشەیە، چونکە ئەوکاتەیە کە منداڵ زیاتر ئامادەیە بۆ گەشەو خۆ گونجاندنی دەرونی و ژینگەیی، لەبەرئەوە دەرونناسەکان کۆکن لەسەر ئەژمارکردنی ئەم قۆناغەو بە قۆناغی هەستیار ناوی دەبەن، لەبەرئەوەی کاریگەریی زۆری لەسەر پێگەیشتن و بونیاتنانی مرۆڤ لە ئایندەدا دەبێت، هەروەها کاریگەریی لەسەر پەرەپێدانی تواناکانی و ئامادەیی فێربونی هەیە، لەم قۆناغەدا ویژدانی منداڵ دەخولقێت و تیایدا لە خود سەنتەرییەوە وردە وردە دەردەچێت، دەکرێت بڵێین کە پەروەردەی منداڵ لەڕویەکەوە زانستەو لە ڕویەکی ترەوە هونەرە، زانستە لەو لایەنەوە کە ئامڕازە پەروەردەییەکان ڕیکدەخات لەپێناو چاودێرییەکی گشتگیر و هەمەلایەنەی منداڵ و تیۆر و پرەنسیپی پەروەردەی بۆ دادەنرێت تا پەروەردەکاران و ئەو کەسانەی لەو بوارەدا کاردەکەن پەیڕەوی بکەن، هونەریشە لەبەرئەوەی ئەو کەسانە تێیدا سەرکەوتوو دەبن کە منداڵیان خۆش دەوێت و توانای مامەڵەکردنی زانستیانەو گونجاویان هەیە (بابان و ئەوانی تر، 2016 :5-6). باخچەی منداڵان ئەو شوێنەیە لەڕوی پەروەردەییەوە هەردوو بوارەکە لەخۆ دەگرێت و دەتوانێت لەڕوی پەرەپێدانەوە منداڵ ئاڕاستە بکات. باخچەی منداڵان دەزگایەکی پەروەردەیی تایبەتە بە منداڵانی قۆناغی پێش چوونە قوتابخانە، لەم دەزگایەدا منداڵ ڕادەهێنرێت بۆ چوونە دەرەوە لە سنوری خێزان بۆ کۆمەڵگەی خوێندنگەو هاوپۆل و هاوڕێ (بابان و ئەوانی تر، 2016 :9).

باخچەی منداڵان بە قۆناغێکی جیاواز دادەنرێت لە گەشەی منداڵاندا، کە زۆرترین توانای گۆڕینی ڕەفتاری منداڵانی لەڕوی دەرونیی و کۆمەڵایەتی و ئاکارییەوە هەیە، منداڵ لەم قۆناغەدا زۆرترین کاریگەریی لەڕوی دروستبونی بەها ئاکاریی و کۆمەڵایەتییەکانەوە لەسەر دەبێت، هەروەها لەڕوی سەربەخۆیی خود و خۆشەویستی کارو هاوکاریی و ڕێزگرتن (مهودر، 2012 :86).

توێژینەوەی (ابورخیة، 2013) ئاماژەی بەوە کردووە چیرۆکی منداڵان کاریگەریی لەسەر هەندێك لە کارامەییە گوزارشتە زارەکیی و داهێنانەکانی منداڵان دروست دەکات، هەروەها توێژینەوەی (الارحبي، 2014) ئەوە دەخاتەڕو، بەکارهێنانی چیرۆك لە گەشەپێدانی هەندێك لە بەها ئاکارییەکان کاریگەریی لەسەر منداڵانی باخچە دروست دەکات، هەروەها توێژینەوەی (الشبلاوي، 2017) ئاماژەی بەوە کردووە بە کارهێنانی چیرۆك لە وانەوتنەوەدا لە بابەتەکانی زمانی عەرەبی کاریگەریی لەسەر زمان پاراوی قوتابیان بە پلەیەکی بەرز دروست دەکات، توێژینەوەی (ماجدة و ئەوانی تر، 2018) ئاماژەیان بەوە کردووە کە چیرۆك کاریگەریی زۆری لەسەر زمان پاراوی منداڵان جێدەهێڵێت، توێژینەوەکەی (کاویاني، 2020) جەختی لەسەر ئەوە کردووەتەوە کە چیرۆك بەسوود و کاریگەرە لە دەستکەوتنی بەها لای خوێندکاران، ، کەواتە بەکارهێنانی چیرۆك بۆ منداڵانی باخچە کاریگەریی تەواو لەسەر منداڵان دروست دەکات بە لەبەرچاوگرتنی جۆری چیرۆك و کارەکتەرەکانی.

ئەو کاریگەریانەی کە باخچە لەسەر منداڵ دایدەنێت دەکرێت گونجاو بێت یان گونجاو نەبێت، یان دەکرێت ئەرێنی بێت یان نەرێنی ، ئەویش لە شێوەی ئەزموونێکی گرنگدا دەردەکەوێت کە دەبێتە بەشێك لە کەسێتی منداڵ (کاظم، 2013 :692).

کەواتە چیرۆك و گێڕانەوەی چیرۆك بۆ منداڵان بە یەکێك لە بنەما سەرەکییەکانی بواری پەروەردە و گۆڕینی ڕەفتاری منداڵ دادەنرێت لەڕوی (ئاکاریی و ویژدانی و سۆزی)یەوە، لێرەوە توێژەر هەستی بەو کێشەیە کردووە، تارادەیەکی باش لە باخچەکاندا گرنگی بە چیرۆکی منداڵان نادرێت و پشتگوێ دەخرێت، لەبەرئەوە دەیەوێت توێژینەوەیەك ئەنجام بدات بەناونیشانی (کاریگەری چیرۆک لە گەشەپێدانی بەها ئاکاریەکان لای منداڵانی باخچە)، بۆ ئەو مەبەستەش پێویستە وەڵامی ئەو پرسیارانە بدرێنەوە کە بوەتە گرفتی توێژینەوەکە:

1. ئایا باخچەی منداڵان گرنگی بە چیرۆکی منداڵان دەدەن؟
2. ئایا چیرۆکی منداڵان کاریگەریی هەیە لەسەر منداڵ لە دەستکەوتنی بەهای ئاکاریی؟

### 2-1 گرنگی توێژینەوەکە

ئەدەبی منداڵان (چیرۆك)، یەکێکە لەو شێوازە گرنگانەی قۆناغەکانی ژیانی مرۆڤ بە گشتی و قۆناغی منداڵان بە تایبەتی، کە زۆربەی دەروونناسان و پەرەوەردەکاران جەخت لەسەر ئەم قۆناغە دەکەنەوە، چونکە دروستی ئەم قۆناغە بەردی بناغەی دروستکردنی نەوەیەکی دوارۆژە، لەبەرئەوە بەشێوەیەکی گشتی لە هەموو جیهاندا بایەخێکی زۆر بە چیرۆکی منداڵان دەدریت، چونکە (یەکێکە لە شێوازە گرنگەکانی پەروەردەو پێگەیاندنی منداڵ، لەڕێگەی ئەم ئەدەبەوە ژیان بە هەموو ڕەهەندەکانیەوە ئێستا و ڕابوردوو و داهاتوو دەبەسترێتەوە، منداڵ لەناو ئەدەبدا ژیانە خەیاڵیەکەی خۆی دەدۆزێتەوە، لەناو ئەدەبدا هەست و تێگەیشتن و پەیبردنی زیاتر دەبێت (صبري، 2010 :7).

مرۆڤ هەر لە کۆنەوە چیرۆکی بە بەشێك لە ژیانی خۆی زانیوە، بەهۆی ئەو ڕۆڵ و کاریگەریەی هەیبوە لەسەری، هەر بەو پێیە بە میتۆدێکی زانستی و پەروەردەیی دادەنرا، لە کۆمەڵگەدا چیرۆک بۆ چاندنی هەندێک بەهای ئاکاری و کۆمەڵایەتی لە لای منداڵان وەرگیراوە، چونکە ڕۆڵی لە کاریگەریی دانان و ڕازیکردن و پەروەردەکردنی منداڵدا هەیە. هەر ئەمەش وایکردووە چیرۆك لە ژیانی منداڵدا گرنگییەکی زۆری هەبێت، بەهۆی ئەو توانایەی بۆ ڕاکێشانی سەرنجی منداڵ هەیەتی، هەروەها دەبێتە هۆی بەرزکردنەوەی هەست و وروژاندنی منداڵ، لێرەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت گرنگی چیرۆک تەنیا کولتووری نیە، بەڵکو هەموو لایەنەکانی ژیانی منداڵ دەگرێتەوە، گرنگی چیرۆک بۆ منداڵ لە ئامانجەکانی چیرۆکەکە و ئەرکە پەروەردەییەکەیەوە سەرچاوە دەگرێت و خوێندنەوەی چیرۆکەکە بۆ منداڵ لە تەمەنێکی بچووکدا یەکێکە لەو هۆکارانەی کە یارمەتیدەرە بۆ گەشەکردنی لایەنی ئاکاریی و مەعریفی و ویژدانی و زمانەوانی منداڵ (ابومعال، 2005 :33).

گرنگی بەهای ئاکاری لە ژیانی مرۆڤدا جێگیرەو پێویستی بە هەوڵ و تێکۆشان نیە، یان ئاڵوگۆڕ نیە، بەڵام ئامڕازەکانی بەدەستهێنان و جێبەجێکردنی جۆراوجۆرە، کە خۆی لە نێوان تەواوکاریی و مەبەستداریدا دەبینێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندییەکی توندوتۆڵ لەنێوان بەها و پەروەردەدا هەیە، هەر لەم ڕێگەیەشەوە دەتوانرێت داڕشتنەوەی ئامانجە

پەروەردەییەکان بکرێت لەسەر بنەمای فەلسەفەی پەروەردە و بونیاتنانی بەهای ئاکاریی و دەرونی و کۆمەڵایەتی و فیکری و ڕەفتاری (نصیرات، ب.ت :555 -556).

توێژینەوە لەسەر بەهای ئاکاریی مرۆڤ بە گشتی و منداڵ بە تایبەتی گرنگە، چونکە (بەهای ئاکاری بریتییە لە کۆی ئەو چەمک و بەها و تێگەیشتن و بیروباوەڕ و یاسا و بنەما و داب و نەریتە، کە ڕەفتارێکی تایبەت لە مرۆڤدا پێکدەهێنن و بۆ ئەو شێوازێکی دیاریکراوی ژیان و حوکمڕانی و مامەڵەکردن لەگەڵ ئەوانی دیکەدا دیاری دەکەن لە هەر گەلێک، بەبێ گوێدانە جیاوازی نێوان بیروباوەڕ و مەزهەبەکان؛ چونکە بەها ئاکارییەکان نوێنەرایەتی مەبەستەکان دەکەن لە هێنانەدی، جگە لەوەش بەها و ئاکار و بنەما ئاینیەکان پێویستیەکی گرنگن بۆ بنیاتنانی کۆمەڵگەیەکی تەندروست (عبید، 2020 :449)

گێڕانەوەی چیرۆک بۆ منداڵان کارێکی پێویست و گرنگە و یەکێکە لەفاکتەرە کاریگەرەکانی ناوپڕۆسەی پەروەردەوفێرکردن، لەبەرئەوەی منداڵ ناتوانێ گوێ لەئامۆژگاری و وتاری گەورەکان بگرێت، هەروەها چیرۆک بیروخەیاڵی منداڵ فراوان دەکات و وایلێدەکات دنیا بەجۆرێکی جوانتر  ببینێت، دنیای منداڵان دنیایەکی پاک وبێگەرد و جوانە و پڕێتی لەخەونی ڕەنگاوڕەنگ، لەبەرئەوە دەبێت ئەوانەی بەئەرکی پەروەردەیی هەڵدەستن کەسانی شارەزاو پسپۆڕبن (عەبدوڵا، 2021).

بەکارهێنانی چیرۆك لە باخچەی منداڵان بە یەكێك لە هۆکارە سەرکەوتووەکانی بواری پەروەردە دادەنرێت، چیرۆك كاتێك تێكەڵ بە پرۆسەی پەروەردە دەبێت کە لەگەڵ دوولایەندا پەیوەندی دروستبکات، لایەنی بەهای پەروەردەیی، لایەنی ئاکاریی و ڕەوشت. منداڵ بە زیرەکی خۆی کارلێکی لەگەڵ دروست دەکات و دەبێتە پاڵنەرێکی کاریگەریی لە وروژاندنی ویژادنی منداڵ، هەر ئەمەش وادەکات کە پەیامی ژیان و ئامانج بە منداڵ بدات، دەبێتە هۆی پڕکردنەوەی پێویستییە خەیاڵییەکانی، جیهانێکی جۆراوجۆر لە وێنە دەبەخشێتە منداڵ و کاری تێدەکات، هۆشیاریی فراوان دەکات، زمانی گەشەدەکات و دیمەنێك لە ژیانی پڕ لەڕەنگ و جوڵە دەکات (برغش، العربي، 2018 :49) .

چیرۆك گرنگییەکی بنەڕەتی بۆ منداڵ هەیە، چونکە لەناخی منداڵدا تۆوی بەهاو بنەماکانی دەچێنێت و گەشە بە لایەنەکانی کەسێتی لەڕوی هەستی و عەقڵی و ڕوحیی و ویژدانیی و جوڵەییەوە دەدات، منداڵ کاتێك گوێبیستی چیرۆکێك دەبێت وا خەیاڵ دەکات، پاڵەوانی چیرۆکەکەیە بە تایبەت ئەگەر ڕوداوەکانی ڕاستی و واقعی بن، بەو پێیەی لە واقیعی خۆی و ئەو سنوورانەی تێیدا دەژی، ڕزگاری دەکات و دەچێتە جیهانێکی فراوانەوە (الندوي، 2019).

**3-1 ئامانجی توێژینەوە**

ئامانجی توێژینەوەکە بریتیە لە:

1. زانینی کاریگەری چیرۆك لە گەشەپێدانی بەها ئاکارییەکان لای منداڵانی باخچە ئاستی دووەم تەمەن(5ساڵ).
2. زانینی ئاستی جیاوازی بەها ئاکارییەکان لەپێش و لە دوای ئەزمونەکە بەپێی گۆڕاوەکانی (تەمەن، ڕیزبەندی منداڵ لە خێزاندا، ڕەگەز) بۆ گروپی کۆنترۆڵ.

**4-1 گریمانەی توێژینەوەکە**

1. جیاوازی ئاماری نییە لە سەر ئاستی بەڵگەداریی (0.05) لە نێوان ناوەندی ژمێرەیی نمرەکانی تاقیکردنەوەی پێشەکی و پاشەکی منداڵانی گرووپی ئەزموونی، لە تاقیکردنەوەی چیرۆك بۆ بەهای ئاکاری .
2. جیاوازی ئاماری نییە لە سەر ئاستی بەڵگەداریی (0.05) لەنێوان ناوەندی ژمێرەیی نمرەکانی تاقیکردنەوەی پێشەکی و پاشەکی منداڵانی گروپی (ئەزموونی) بەپێی گۆڕاوی (تەمەن) لە تاقیکردنەوەی چیرۆك بۆ بەهای ئاکاری.
3. جیاوازی ئاماری نییە لە سەر ئاستی بەڵگەداریی (0.05) لەنێوان ناوەندی ژمێرەیی نمرەکانی تاقیکردنەوەی پێشەکی و پاشەکی منداڵانی گروپی (ئەزموونی) بەپێی گۆڕاوی (ڕیزبەندی منداڵ لە خێزاندا) لە تاقیکردنەوەی چیرۆك بۆ بەهای ئاکاری.
4. جیاوازی ئاماری نییە لە سەر ئاستی بەڵگەداریی (0.05) لەنێوان ناوەندی ژمێرەیی نمرەکانی تاقیکردنەوەی پێشەکی و پاشەکی منداڵانی گروپی (ئەزموونی) بەپێی گۆڕاوی (ڕەگەز) لە تاقیکردنەوەی چیرۆك بۆ بەهای ئاکاری.

5. نەبونی جیاوازی ئاماری بەڵگەداری (0.05) لە نێوان ناوەندی ژمێرەیی نمرەکانی تاقیکردنەوەی پێشەکی و پاشەکی لە نێوان گروپی ئەزمونی و کۆنترۆڵ پێش گێڕانەوەی چیرۆك.
6. نەبونی جیاوازی ئاماری بەڵگەداری (0.05) لە نێوان ناوەندی ژمێرەیی نمرەکانی تاقیکردنەوەی پێشەکی و پاشەکی لە نێوان گروپی ئەزمونی و کۆنترۆڵ دوای گێڕانەوەی چیرۆك.

## 1-5 سنوری توێژینەوە

1. سنوری شوێن: باخچەی کازیوەی حکومی لە شاری سلێمانی.
2. سنوری کات: وەرزی دووەمی ساڵی خوێندنی ( 2022 – 2023).
3. سنوری مرۆیی: منداڵانی باخچەی کازیوەی حکومی، ئاستی دووەم تەمەن(5) ساڵ.
4. سنوری بابەتی: کاریگەریی چیرۆك لە گەشەپێدانی بەها ئاکاریەکان لای منداڵانی باخچە.

## 1-6 پێناسەی چەمك و زاراوەکان

**لەم بەشەدا پێناسەی ئەو زاراوانە دەکرێت کە گۆڕاوەکانی توێژینەوەکە پێکدەهێنن:**

**1. چیرۆك (Story)**

- **پێناسەی (عبدالعزیز، السید، 2017)**

جۆرێکە لە جۆرەکانی ئەدەب، جوانی و هونەر و خۆشی تێیدا دەبینرێت، خۆی لە بیرۆکەی نوێ و بونیادنان و گرێی دروست و شێوازی زمانەوانی و کارەکتەری زیندوودا دەبینێتەوە، کاریگەریی لەسەر گەشەکردنی کارامەیی و ژیری منداڵ دروست دەکات (عبدالعزیز، السید، 2017 :412).

- **پێناسەی (سەرابی، 2018)**

چیرۆك بریتیە لە گێڕانەوەی ڕوداوێك، یان کۆمەڵە ڕوداوێکی ژیان یان سروشت، بە شێوەیەکی هونەریانە دادەڕێژرێت و دەبێتە جێی سەرنج و بزواندنی هەستی جوانیی و پەرەپێدانی لێکدانەوەکانی وەرگر لە بەرانبەر ژیاندا (سەرابی، 2018).

**پێناسەی تیۆری چیرۆك**

کارێکی هونەرییە، هەستێکی خۆشی و شادی دەبەخشێت و تایبەتمەندە بە توانای سەرنجڕاکێشان و گەشەکردنی خەیاڵ، بۆ مەبەستێکی ئاکاری یان زمانەوانی یان کات بەسەربردن بەکاردێت.

**پێناسەی ڕێکاری چیرۆك**

ئەو دەقە نووسراوانەیە لەڕێگەیەوە کاریگەریی لەسەر بەها ئاکارییەکانی منداڵ لە باخچەی منداڵاندا دروست دەکات.

**2. چیرۆکی منداڵان (Children's Story)**

- **پێناسەی (ابراهیم و اخرون، 2004)**

چیرۆکی منداڵان نووسینێکە بۆ منداڵان بەشێوەی پەخشان، بە مەبەستی گەیاندنی خۆشگوزەرانی و ڕۆشنبیرکردنی، واتە گێڕانەوەی چەند ڕوداوێکە بەسەر چەند کەسێکی دیاریکراو و لە کات و شوێنێکی دیاریکراودا دێن و تێدەپەڕن، کەسێتییەکانیش ڕەنگە مرۆڤ یان ئەفسانەیی بن، یاخود سەر بە جیهانی گیانداران یان بێگیانیان بن، ئەمانەش بەمەبەستی بنیاتنان کەسێتییە بۆ منداڵ (ابرهیم واخرون، 2004 :332).

- **پێناسەی (الغامدي، 2011)**

بە یەکێك لە ڕەگەزەکانی ئەدەبی منداڵان دادەنرێت کە منداڵان تاموچێژێکی تایبەتی خۆی لێدەبینێت لەکاتی خوێندنەوە و گوێگرتندا، هەر لەو ڕێگەیەشەوە منداڵان دەیانەوێت پەیامی خۆیان بگەیەنن بە ژینگەی دەوروبەریان و بیکەنە کلیلێك بۆ کردنەوەی هەستەکانیان بەرامبەر بە خەڵك (الغامدي، 2011 : 30).

**پێناسەی تیۆری چیرۆکی منداڵان**

ئەو دەقە نووسراوانەیە کە کاریگەریی لەسەر ڕەفتاری منداڵ دروست دەکات و لەڕێگەی چەند ڕوداوێکەوە و لەڕێگەی گێڕانەوەوە بە گوێی منداڵ دەگات، لەم ڕێگەیەشەوە منداڵ تام و چێژی تایبەتی لێوەردەگرێت.

**پێناسەی ڕیکاری چیرۆکی منداڵان**

دیـاریکردنی کاریگەریـەکانی ئـەو چیرۆکانـەی تـوێژەر ئامـادەیکردوون لەسـەر منـداڵان لەڕیگەی تاقیکردنەوەی ئەزموونی توێژینەوەکەوە خۆی لە (7) چیرۆکدا دەبینێتەوە.

### 3. بەها (Values)

- **پێناسەی (زهران، 1997)**

گوزارشتە لە ڕێکخستنە عەقڵی و هەڵچوونیەکان بەشێوەیەکی گشتی لای مرۆڤ، هەروەها گوزارشتە لە پاڵنەرەکانی مرۆڤ و نموونەی ئەو بابەتانەیە کە ئارەزوەکانی بۆ ئاڕاستە دەکرێت، یـان بـەها دەرەنجـامی کـارلێکی کۆمەڵایەتییـە، مـرۆڤ فێـری دەبێـت یـان بەدەسـتیدەهێنێت لەڕێگـەی کـارلێککردنی کۆمەڵایەتییـەوە یـان بـەهۆی هەنـدێك پاڵنـەر و ئامـانجی تایبەتییـەوە گەشەدەکات و بەدەست دێت (زهران، 1997 :133).

- **پێناسەی (مصري، 2020)**

بەها کۆمەڵێك تێڕوانین و تێگەیشتنە کە مرۆڤ لە ئـەنجامی مامەڵـەکردن و کـارلێکردن لـە هەڵوێست و شارەزاییەکاندا لەناو کۆمەڵگـەدا فێـری دەبێـت، بـە ئـەنجام گەیشـتن بـە ئامـانج و ئاڕاستەکردنی ژیانی بەشێوەیەکی گونجـاو یـان ئاڕاسـتەکردنی ڕەفتـاری کـرداری یـان زارەکـی بەڕێگەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ (مصري، 2020 :73).

- **پێناسەی (ئیسماعیل، احمد، 2022)**

بەها ئەو پرۆسە کرداریەیە ڕۆڵی لە ڕێنماییکردنی ڕەفتاری مرۆڤ و کۆمـەڵ هەیـە، چونکـە وایانلێـدەکات بڕیـار بـدەن لەسـەر ئـەو پراکتیکـە کرداریانـەی ئـەنجامی دەدەن و بنەمایـەکی دروستن بۆ بونیادنانی پەروەردەی جیاواز، بەشـداری لـە دروسـتبونی دەرونـی مرۆڤـدا دەکـەن (ئیسماعیل، احمد، 2022 :11) .

**پێناسەی تیۆری بەها**

کۆمەڵێك ئاکارە یان ڕەفتارە مرۆڤ لەناو کۆمەڵگەدا بەدەستی دەهێنێت لە ئەنجامی مامەڵەکردن و کالێککردن، دواجار لەڕیگەیەوە بڕیار لە ڕەفتارەکانی مرۆڤ دەدرێت و وەك پاڵنەرێکی کۆمەڵایەتی سەیر دەکرێت.

**پێناسەی ڕێکاری بەها**

ئەو ڕەفتار و ئاکارییە ڕەوشتییە کە منداڵ لەئەنجامی مامەڵەکردن و تێبینیکردنی لە چیرۆکەکاندا وەریدەگرێت.

**4. بەهای ئاکاری (Moral Values)**

- **پێناسەی (القصیر، 2012)**

بریتیە لە سیفەتی مرۆڤ و پەیوەستە بە بەهاوە، مرۆڤ لە ئەنجامی کارلێککردنی لەگەڵ خودی خۆی دروستی دەکات (القصیر، 2012: 348).

- **پێناسەی (الامام، 2015)**

بەهای ئاکاری لە کۆمەڵێك پێوەر و بڕیار پێکهاتووە، مرۆڤ لە ئەنجامی کارلێککردنی لە هەڵوێست و شارەزاییە مرۆییەکان لەناو کۆمەڵگەدا بەدەستیهێناوە، بە ئامانجی تەواوکردنی ئەو ئامانجەی ژیانی پێ ئاڕاستە دەکات، ئەم بەها ئاکارییە بەهۆی گرنگیپێدان و ئاڕاستەکردن یان ڕەفتاری کرداری و زارەکی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بەرجەستە دەبێت (الامام، 2015: 6).

- **پێناسەی (رفعت، د.ت)**

بەهای ئاکاریی بریتیە لە ڕێکخستنەوەی دەرونی، کە مرۆڤ لەڕێگەی ژیانکردنیەوە بەدەستی دەهێنێت لە سەرچاوەکانی وەکو دابونەریت و کلتور لە ناوەندی کۆمەڵگەدا، هەڵدەستێت بە جێبەجێکردنی لەڕوی کرداریەوە، ئەم بەهایەش کاتێك بەدەردەکەوێت کە مرۆڤ مامەڵە لەگەڵ خودی خۆی و کۆمەڵگەدا دەکات (رفعت، د.ت: 384) .

**پێناسەی ڕیکاری بەهای ئاکاری**

ئەو نمرەیەیەی بە دەست دێت لە ئەنجامی ئەزمونکردنی پێوەرەکە بەسەر منداڵاندا لە گروپی ئەزموونی.

**پێناسەی تیۆری بەهای ئاکاری**

ئـەو پێـوەر و بڕیـار و خـۆ ڕێکخسـتنەوەیەیە کـە منـداڵ ئـەزموونی دەکـات و لەڕێگـەی خستنەڕو یان گێڕانەوەی چیرۆکەوە بەدەستی دەهێنێت.

# بەشی دووەم

## چوارچێوەی تیۆری و توێژینەوەکانی پێشوو

### 1-2 چیرۆکی منداڵان

### 2 -1 -2 چیرۆکی منداڵان

چیرۆکی منداڵان شێوەیەکە لە شێوەیەکانی هونەر و یەکێکە لە هونەرەکانی قسەکردن کە منداڵ زیاتر ئارەزوی بۆی هەیە، هۆکارە بۆ وروژاندنی منداڵ و بەئاگابونی، لەگەڵ ئەوەشدا چیرۆکی منداڵان جوڵەیەکی بەردەوامە لە نوێبونەوەی منداڵ، بەهۆی نوێ بونەوەی چیرۆکەکان و داهێنان تێیدا، لەبەرئەوەی چیرۆك بە بەشێك لە پاڵنەرەکان دادەنرێت بۆ منداڵ کە لەرێگەیەوە منداڵ تواناو لێهاتوییەکانی لە گوێگرتن و نووسین و خوێندنەوە زیاد دەکات (احمد، 2006 :121).

چیرۆکی منداڵ وەك یەکێك لە بەهێزترین ڕەگەزەکانی ئەدەب بە تایبەت ئەدەبی منداڵ دادەنرێت کاریگەریی لەسەر خودی منداڵ دروستدەکات بەرامبەر بە هەست و هەڵچوونەکانی، لەهەمانکاتدا کاریگەریی لەسەر ڕەفتار و مامەڵەکردنی دروستدەکات، ئەمەش ئەوە دەردەخات چیرۆکی منداڵان تەنها کاریگەریی لەسەر لایەنی ڕۆشنبیریی منداڵ نیە، بەڵکو سەرجەم لایەنەکانی ژیانی دەگرێتەوە (ابومعال، 2005: 33).

چیرۆکی منداڵان هۆکارە بۆئەوەی بیرکردنەوەی ڕەخنەیی و زانستی بوروژێنێت و پاڵنەرێك بێت بۆ دۆزینەوەی چارەسەر بۆ گرفتەکان. هەروەها لەگەڵ سرود و شانۆی منداڵان بەیەکێك لە ئامرازە بنەڕەتییە ڕۆشنبیرییەکانی منداڵ دادەنرێت، بۆ پێشکەوتنی منداڵ لە باخچەدا، بەمەبەستی بەدەستهێنانی ئامانجی پەروەردەیی گرنگی پێدەدرێت و بۆ سەرجەم وانەو بوارەکان پەرەی پێدەدرێت (العنزي، 2020 :69).

تایبەتمەندی هونەری یەکێکە لە ڕەگەزەکانی چیرۆکی منداڵان، لە کۆمەڵێك گوزارشت و دەربڕین و ڕستە و تێکەڵەیەك لە ڕودای ڕاستی و خەیاڵی پێکهاتووە، پێویستە لەڕوی ژینگەی کات و شوێنەوە گونجاو بێت و سەرجەم بەها مرۆڤایەتییەکانی تێدا بەرجەستە بێت و

ڕونبێت بۆئەوەی پێداویستییە ویژدانی و عەقڵی و دەرونیەکانی منداڵان پڕبکاتەوە(الهيتمي، 1998 : 172).

چیرۆکی منداڵان شێوەیەکی هەمەچەشنەیە لە ئەدەبی چیرۆکی زارەکی و نووسراو، خۆی لە چەندین ڕوداو و گێڕانەوەدا دەبینێتەوە بەسەرجەم جۆرەکانیەوە، هەروەها بە یەکێك لە هونەری گێڕانەوەی داپیرەو باپیرە دادەنرێت، یان لەلایەن چیرۆکنوسانەوە دەنووسرێتەوە بەجۆرێك کە بۆ تەمەنی منداڵ گونجاو بێت، یان ئەوەتا لەسەر زاری ئاژەڵان و باڵدارانەوە دەگێڕدرێتەوە، لە گرنگترین چیرۆکەکانیش چیرۆکی (هەزار و یەك شەوە)یە (زلط، 2000 :53).

چیرۆکی منداڵان پێگەیەکی گەورەو جوانی لە ئەدەبی منداڵدا هەیە، لای منداڵ زۆر خۆشەویستە، چونکە جیادەکردنەوە بەوەی منداڵ خۆشی و چێژی لێدەبینێت و بەئاسانی لێی تێدەگات و هۆکارێکە لە هۆکارەکانی چاندن و بلاوبونەوەی ڕۆشنبیریی زانیاریی لای منداڵان (علي، 2005 :18).

چیرۆکی منداڵان زۆر لە بیرکردنەوە و خودی منداڵەوە نزیکە ، چونکە منداڵ زیاتر هەست بە جوانی چێژوەرگرتن لە چیرۆکدا دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا ئامڕازێکە بۆ گواستنەوەی مەعریفەو زانیاریی بۆ منداڵان، لەگەڵ ئەوەشدا خۆشەویستی خوێندنەوە و بەهێزبونی زمانەوانی لای منداڵان زیاد دەکات، هەندێك لە پێویستییە دەرونیەکانی منداڵان پڕدەکاتەوە، کە منداڵ بەدوایدا دەگەڕێت (عطاء، 2005 :77).

چیرۆك بە یەکەم وێستگە لە ئەدەبی منداڵدا دادەنرێت، ئەدەبی منداڵ جۆرێکە لە هونەری ئەدەبی خۆی لە چەندین شێوەدا دەبینێتەوە، وەك (پەخشان و هۆنراوە) کە دانراون تایبەت بە منداڵان، ئەدەبی منداڵان وەك ئۆرگانێکی زیندووی ئەدەبی هاوچەرخی کورد دادەنرێت، نیشانەیەکی دیاری ئاستی پێشکەوتنی فەرهەنگی کوردستانە، گەرچی کۆمەڵێك بەرهەمی شیعری و چیرۆك و مەتەڵ و بەرهەمی جۆراوجۆر لە فۆلکلۆر و کەلەپوری کوردا تایبەت بە منداڵان هەبوە، بەڵام ئەدەبی نوسراوی منداڵانی کورد لە کوردستان لە بیستەکانی سەدەی ڕابردودا دەستیپێکردووە، لەبەرئەوەی وا پێویست دەکات ئەدەبی منداڵان لە مێژووی ئەدەبی

کوردیدا بەشیوەیەکی دروست و لۆجیکانە بەشەکانی دیاری بکرێن و ریزبەندییەکی زانستیانە بکرێت کە بتوانرێت شوێنی ئەدەبی منداڵان لە پرۆسەی مێژویی ئەدەبی کوردیدا دیاری بکرێت و ئاماژە بە قۆناغە سەرەکییەکانی بدرێت (ئەحمەد، 2005 :59).

چیرۆکی منداڵان سەرچاوەیەکی سەرەکی سەرنجراکێشانی منداڵە، چونکە کاریگەریی لەسەر بودنیادنانی کەسێتی منداڵ دەبێت، گرنگیدان بە پێوەرەکانی چیرۆکی منداڵان، لە پێویستیە سەرەکیەکانی خستنەڕوی دەقی چیرۆکە، پێویستە لەڕوی داڕشتن و گێڕانەوە و کەسێتی ناو چیرۆکەکان گرنگی پێبدرێت (القاعود، 2007 :225).

ئەگەر لەڕوی چەمکەوە لە چیرۆکی منداڵان بڕوانین ئەوا بە نزیکترین هونەری ئەدەبی دادەنرێت بە درێژایی ژیانی مرۆڤ کە کاریگەریی زۆر لەسەر مرۆڤ دروست دەکات، چیرۆك لەگەڵ ئەو گرنگییە زۆرەی هەیەتی، گرنگییەکەی بۆ منداڵ لەڕوانگەی چیرۆکی گەورەوە دەردەکەوێت، بە تایبەت لە سەدەی نوێدا و ئەو کاتەی کە پەروەردەکاران گرنگییان بە چیرۆکی منداڵان داوە و باوەڕی تەواویان بەوە هێنا کە چیرۆك پێویستە لە بواری پەروەردەدا پێویستە گرنگی پێبدرێت، چونکە منداڵ لەسەرەتای قۆناغەکانی ژیانی کاریگەریی چیرۆك زیاتر بەدەردەکەوێت و ڕۆڵێکی گرنگ لە ژیانیدا دەبینێت لە بونیادی کەسێتی و گەشەکردنی بیروبۆچوونەکانی و زانیارییەکانی و خەیاڵکردن و ڕەفتارەکانی، لەگەڵ ئەوەشدا چیرۆکی منداڵ کاریگەریی لەسەر گەشەی زمانەوانی لای منداڵ دروست دەکات، هەر لەبەر ئەم گرنگیانە بو کە لە ئەدەبدا جێگەی کرایەوە و گرنگییەکی زۆری پێدرا (لهلالي، 2014 :19).

کاتێك چیرۆك، تەریب بە قۆناغە ژیارییەکانی مرۆڤدا دەڕوات، ئەویش لە نوێبونەوەو گۆڕانی بەردەوامدایە، خۆبەخۆ لەناو تێڕوانین و گێڕانەوەی جیاجیادا کاردەکات و دەکرێت شێوە فۆڕمێکی دیاریکراوی نەبێت. لەبەرئەوە هەمیشە چاوەڕوانی ئەوە دەکرێت، بەپێی ئەو ئەزموون و قۆناغەی چیرۆکنوس پێیدا تێپەڕ دەبێت، تەکنیك و شێوەی جۆربەجۆری نوێی گێڕانەوەش بێتەئاراوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەموو گێڕانەوەیەك چیرۆك نیە، بەڵکو چیرۆك واتە هونەری گێڕانەوە (السرد)، واتە ئەو کاتەی چیرۆکنوس بتوانێت کەمەندکێشی زەین و دڵی وەرگر، یان خوێنەر بکات بۆ ناو ڕوداوەکانی، هەتا خاڵی کۆتایی، واتە ئەو کاتەی چیرۆکنوس

بتوانێت کارلێکێکی هونەریانە لە نێـوان ڕەگـەزەکانی دەقەکەیـدا دروسـتبکات، چونکـە دواجـار ڕەگەزەکانی دەق دابـڕاونین لـەیەکترو پەیوەندییەکی پتەویان لەگەڵ یەکتردا هەیەو هەمیشە لەکـــارو کارلێکردنــدان. ڕوداو سـۆزو ئەندێشــەی ئــەدیب دەجولێنێــت و ئەندێشــەش وێنــای ڕوداوەکان دەکێشێتەوە، لەگەڵیدا بیرکردنەوەو قووڵبونەوە لە ڕوداوەکان و دواجـار بەهایـەکی تایبەتی مرۆیانەی پێدەبەخشێت، لەگەڵ بەستنەوەی بە کات و شوێن و ڕیزبەنـدکردنی بیرۆکـە لەناویاندا نیشاندانی ناکۆکییە ماددی و کەسێتییەکان، بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش کە کۆتایی بە ئامانجێکی دیاریکراو دێت (سەرابی، 2018).

لەبەرئـەوە گێڕانـەوەی چیـرۆك بـۆ منـداڵان جـۆرێکی دەربـڕینە و تایبەتـە بـە منـداڵان، بەشیوەیەکی گشتی مەیلیـان هەیە و تـامەزرۆی بیسـتن و خوێنـدنەوەی چیـرۆکن بەهـۆی ئەو پاڵنـەرانی لەخۆیـدەگرێت لە سـەرنجدان و وروژانـدن، هـەروەها کـاریگەرییەکی ڕونـی لەسـەر پەروەردەی منـداڵان دەبێـت، چیرۆکـی منـداڵان لـەڕوی ژانـەری ئەدەبییـەوە ئامانجـەکانی بـۆ منداڵان زیاتر و ئاسانتر فەراهەم دەبێت و زیاتر دەتوانێت لەژیانی ڕۆژانەیدا ئـەزموونی بکـات، لەبەرئـەوەی منـداڵان زیـاتر ئـەم ژانـەرە ئەدەبییـە قبوڵدەکـەن، چونکـە ئـەو بابەتانـەی تێـدا دەدۆزینەوە کە پێداویستییەکانیان پڕدەکاتەوە (ابومعال، 2005 :131).

هەروەها شێوازی چیرۆك گێڕانەوە بە یەکێك لە کاریگەرترین هۆکارەکانی فێربون بۆ منداڵ دادەنرێت، لەڕێگەیەوە بەهاکان گەشەی پێدەدرێت و لە ناخی منداڵدا دەچێنرێـت، ئەمـە جگـە لەوەی بە بەهێزترین هۆکاری ڕاکێشانی منداڵ دادەنرێـت وەك ڕێگەیـەکی سروشـتی، هـەروەها زۆرترین سەرنج لەسەر ڕوداوەکان و ماناکانی دەخاتەڕو، چیرۆک بیرکردنەوەکان و تێکۆشـانی مرۆڤەکانی تێدا دەخرێتـەڕو وەك وروژێنـەرێك و پاڵنـەرێك بـۆ منـداڵ، چونکـە ڕوداوەکـانی بە وێناکردنی سۆز و هەستەکانی مرۆڤەوە دەبەستێتەوە (الوائلي، 2004 :97) .

بۆ قۆناغی منداڵی باشترین شێوازی ڕێگای وانەوتنەوە گێڕانەوەی چیرۆکە، واتە باسکردنی بابەتەکە لەڕێگەی گێڕانەوە و چیرۆکی جۆراوجـۆر، لەبەرئـەوە چیـرۆك لەگـەڵ حـەزو ئـارەزوی جیهانی منداڵدا دەگونجێت، منـداڵ بەوپـەڕی دڵخۆشـیی و بەئاگاییـەوە گـوێ لـە مامۆسـتاکەی دەگرێت (قەرەچەتانی، 2014 :128)

## 2-2-2 جۆرەکانی چیرۆکی منداڵان

چیرۆکی منداڵان هەر وەکو سەرجەم چیرۆکەکانی تر لەڕوی داڕشتن و نووسینەوە لەیەکتری نزیکن، بەڵام کاتێك چیرۆکێك بۆ منداڵان دەنوسرێت دەبێت جیاوازی لەگەڵ چیرۆکەکانی تردا هەبێت، هەر ئەمەش وایکردووە جۆرەکانی چیرۆك بۆ منداڵان جیاوازبن، بابەتەکانی چیرۆکی منداڵان لەڕوی ناوەڕۆکەوە جۆراوجۆرن، لەبەرئەوەی ناتوانین بەشێوەیەکی تایبەت ناوەڕۆکەکانیان لەیەك جۆر بابەتدا کۆبکەینەوە، لەڕوی ناوەڕۆکەوە چیرۆکی منداڵان دابەشکراوە بۆ چەند جۆرێك بریتین لە:

### 1. چیرۆکی گاڵتەئامێز:

گومانی تێدا نیە خۆشی و شادی و پێکەنین دەرون ئارام دەکاتەوە، چیرۆکی گاڵتە ئامێزیش وەك یەکێك لە جۆر و بنەما سەرەکیەکان باشترین هۆکاری سەرنجراکێشانی منداڵانە بۆ ناوەڕۆکی چیرۆکەکە، زۆرجاریش بابەتەکە زیاتر خۆی لە ڕێنمایی و ئامۆژگاریدا دەبینێتەوە و دەکرێت منداڵ لە ژیانی ڕۆژانەیدا جێبەجێیان بکات (ابراهیم، ب.ت :10).

بێگومان منداڵان سەرنجیان بۆلای جۆری چیرۆکەکان جیاوازە، هەر منداڵێك جۆرێك لە چیرۆکی پێخۆشە، چیرۆکی گاڵتە ئامێز یەکێکە لەو چیرۆکانەی منداڵ خۆی تێدا دەبینێتەوە و کاتەکانی بە پێکەنین تێیدا بەسەردەبات و هۆکارێکە بۆ پڕکردنەوەی پێویستی و ئارەزوەکانی(سلیمان، 2018 :61).

ئەم جۆرە لە چیرۆك پشت بەو جیاوازییەی لە ژیاندا هەیە دەبەستێت، مەبەستییەتی کە منداڵ لە هەموو جۆرە گاڵتەیەکی نەرێنی بەدور بگرێت و هەوڵی وروژاندنی خەیاڵی منداڵ دەدات، بەوەش جیادەکرێتەوە، کە چیرۆکەکانی کورت و ئاسانن، دەرەنجامی چیرۆکەکە لە کۆتاییدا دەردەکەوێت و سەرجەم ڕوداوەکانیشی پەیوەستن بە ژیانی ڕۆژانەوە، زۆرجاریش ئەم جۆرە چیرۆکە دوردەکەوێتەوە لە ڕوداوی ڕاستەقینە بەهۆکاری بونی چەند کەسێتییەکی تایبەت لە چیرۆکەکەدا یان چەند ڕوداوێکی نامۆ کە پەیوەندی بە ژیانی ڕۆژانەشەوە نیە (الهيتي، 1998 :202).

ئــەم جــۆرە چیرۆکانــە زیــاتر لــە وڵاتــانی ئــەوروپی و ئــەمریکی بڵاوبوەتــەوە ئەمــەش دەگەڕێتەوە بۆ پێشکەوتنی ئەو کۆمەڵگایانە، لەهەمانکاتیشـدا بـونی کتێبـی چیرۆکـی زانسـتی وەکو پاڵپشتێک و سەرچاوە بەکار دەهێنن. هـەر لەڕێگـەی ئـەم چیرۆکانـەوە چیرۆکـی خـەیاڵی زانسـتی لەسـەر شـانۆی منـداڵان بـەکار دەهێنـێن، پـاش ئـەوەی بودجەیـەکی باشـی بـۆ دابـین دەکرێت . ئەم جۆرە چیرۆکانە تاوەکو ئێستا لەلای خۆمان جێبەجێ نەکراوە، چونکە تەکنیکاری وامان نیە و لە لایەکی تر دەرخستە و بودجەیەکی زۆری دەوێت (احمد، 2004: 68).

## 2. چیرۆکی ئاژەڵان:

ئەم جۆرە لە چیرۆك بە بـەربڵاوترین جـۆری چیـرۆك دادەنرێـت و منـداڵان زیـاتر پێشـوازی لێدەکەن لە جیهانـدا وە لـە پێشـترین جـۆری چیـرۆك دادەنرێـت (بوقـادي، سـلوم، 2018: 43). هۆکاری ناونانی (چیرۆکی ئاژەڵان) بۆ ئـەوە دەگەڕێتـەوە ڕوداوەکـانی لـە دەوروبـەری باڵنـدە و ئاژەڵاندا دەسوڕێتەوە و کەسێتییەکان لە ئاژەڵانن، دەتـوانین بڵێـین یەکێکـە لـە گرنگتـرین ئـەو جۆرانەی کە ئەدەبی منداڵانی بە چیرۆك و حکایەتی چێژدار دەوڵەمەند کردووە (صبري، 2010 :132). ئـاژەڵان ڕۆڵـی سـەرەکی لـەناو چیرۆکەکـەدا دەبیـنن، لـە جـۆری ئـەو چیرۆکانـەش (سەرکەشی، چیرۆکی پاڵەوانان، یان چیرۆکی خەیاڵی یان چیرۆکـی زانسـتی (حفیـان ، 2012 :77).

منداڵان بەشێوەیەکی بەردەوام پەیوەست دەبـن بـە کەسێتییەکانی نـاو ئـەم چیرۆکـەوە، پەیوەندی نێوان منداڵان و ئاژەڵان، بە تایبەت ئاژەڵـە ماڵیـەکان پەیوەندیـەکـی بـاش و بەتینـە، لەگەڵ قۆناغەکانی گەشـەی منداڵـدا گونجـاوە، لەبەرئـەوەی منـداڵ بـە خـەیاڵێکی سـنوردار لـە ژینگەی چواردەوری دەڕوانێت و وەکو ڕاستی پێشوازی لێدەکات (بوقادي، سلوم، 2018: 43).

قۆناغەکانی منداڵی بە پێی تەمـەنیان پـۆلێن دەکرێـت، سـەرەتا هەنـدێك چیرۆکـی ئـاژەڵی سادە و باو و نزیـك لـە منداڵـەوە لـە چوارچێـوەی ژینگەکەیـدا لـە خـۆ دەگرێـت. پاشـان بـەپێی گەورەبونیان و کارلێکیان لەگەڵ ژینگەی دەوروبەریان حەز لە چیرۆکی ئاژەڵی خـەیاڵی دەکـەن و لە دوای تەمەنی هەشت ساڵی، بەتایبەتی ئەوانەی دەوری پاڵەوانێتی دەبینن لـە ئـاژەڵی نـامۆ

کە لە شوێنە دورەکان دەژین، زۆربەی چیرۆکەکانی ئاژەڵان سەرنجی منداڵان تا تەمەنی( 10) ساڵی رادەکێشێت (بریغش، 1996 :213).

چیرۆکی ئاژەڵان چیرۆکی فۆلکلۆر یان ئەفسانەن کە تێیدا ئاژەڵەکان وەک رۆڵی سەرەکی یان بەشداربوی گرنگن لە گەشەکردنی ڕوداوەکاندا ، چیرۆکی ئاژەڵیش جۆرێکی چیرۆکە هێمادارەکانە کە مانای ڕەوشتی لەخۆدەگرێت، چیرۆک و ئەفسانە لە هەموو وڵاتانی جیهان و لە هەموو سەردەمەکاندا بونی هەیە لەگەڵ بونەوەرە سەیرەکان یان چیرۆکی جادوویی، هەندێک چیرۆکی لەم جۆرە پڕن لە ئاژەڵ بە هەموو جۆرێکیانەوە هەندێکیان دڕندەن، هەندێکیان ئارام و هەندێکیان دوژمنایەتی مرۆڤ دەکەن، هەندێکیان خزمەتکارن بۆی، ئەم چیرۆکانە دروستکراون یان داهێنراون بۆ ڕونکردنەوەی هەندێک دیاردەی ترسناک، یان ناتوانرێت لە ڕوی زانستییەوە پاساویان بۆ بهێنرێتەوە، بە هەمان شێوە زۆرێک لە ئاژەڵەکانی ئەم چیرۆکانە لایەنەکانی کەسێتی مرۆڤ بەرجەستە دەکەن و هەندێکیان پەیوەندییان بە سووڕەکانی سروشتەوە هەیە...هتد (عوض، 2015 : www.alukah.net).

نوسەری چیرۆکی منداڵان ئەم جۆرە چیرۆکە وەك سەرچاوەیەکی سەرەکی پشتی پێ دەبەستن لە نووسینی چیرۆکەکانیاندا، چونکە باشترین و زۆرترین خوێنەری بۆ منداڵان هەیە و زۆر بەگەرمی پێشوازی لێدەکرێت، بە کۆنترین جۆری چیرۆکی دادەنرێت کە مرۆڤ پێی ئاشنابو و بەکاریهێناوە و سووودی لێ وەرگرتووە، دەتوانرێت تایبەتمەندیەکانی ئاژەڵان و چۆنیەتی ژیانیان و جیاوازیان لەم ڕێگەیەوە بخرێتە ڕو، گەشەکردنی ئەم جۆرە چیرۆکە وایکرد کە لە بواری زانستیشدا گرنگی خۆی هەبێت، هەروەها بو بە هۆکارێك بۆ باشترکردنی ئاکار و ڕەوشی مرۆڤ لەڕێگەی ئەو ڕەخنانەی کە لە مرۆڤ دەگیران لەزاری ئاژەڵەکانەوە (ابو معال، 2005 :145 - 146 ).

### 3. چیرۆکی خەیاڵی:

خەیاڵ یەکێکە لەو ڕەگەزانەی پێویستە لەناو بەرهەمە ئەدەبییەکاندا رەچاو بکرێت، ئەدەبی منداڵان بە گشتی و چیرۆکی منداڵان بە تایبەتی بایەخێکی زۆری بەم رەگەزە داوە، چونکە منداڵ ئارەزوە دەرونیەکانی خۆی لە ڕێگەی ئەندێشەو خەیاڵەوە تێر دەکات، بەڵام

دەبێت ئەوە بزانین ئەگەر ئەندێشەی گەوران پەیوەست بێت بە ڕاستیەوە، ئەوە لەلایی منداڵان بریتیە لەوەی پێچەوانەی ڕاستیە (صبري، 2006 :15).

چیرۆکی خەیاڵی جۆرێکە لە چیرۆك و مێژوویەکی کۆنی هەیە، لێرەدا ئاژەڵان و باڵندەو بونەوەرە نامۆکان جیهانی دەریایی ڕۆڵی تێدا دەبینن و دەبنە کەرەستەی مرۆیی ناو چیرۆکەکە، خەیاڵ تێیدا باڵادەستە، ئەمەش بە تایبەتمەندی گەلانی پێشتر دادەنرێت، پاڵەوانی چیرۆکەکە هەڵدەستێت بە ئەنجامدانی کۆمەڵێك کار لەسەرو تواناو لێهاتوویی مرۆڤی ئاساییەوەیە، کە مەبەست لێی دروستکردنی بەهایەکی بەرزە، لە دیارترین چیرۆکەکانی ئەم جۆرە چیرۆکی (هەزارو یەك شەوە) (الف ليلة و ليلة) (شحاتة، 1994 :106).

چیرۆکی خەیاڵی هەندێك ڕوداوی تێدا تۆمار دەکرێت بە جۆرێك ڕوداوەکان لەوپەڕی توانای سروشتیدان و مرۆڤی ئاسایی توانای ئەنجامدانی ئەو کارانەی نیە و لە ڕاستیشدا بونی نیە، بەڵام دانەر بە ویستی خۆی و بیرکردنەوەی خۆی ڕوداوەکان دروستدەکات، بەشێوەیەك سەرنجی منداڵ ڕابکێشێت و تواناو لێهاتوییەکانی زیاتر بکات، لەم جۆرە چیرۆکەدا زۆرجار کەسانێك دەردەکەون، کە خاوەنی موعجیزەن و هەڵگری چەندین بەهرەو توانای لەڕادەبەدەرن، لە دیارترین ئەو ناوانەی لەم چرۆکەدا دەرکەوتوون چیرۆکی (سوپرمان)ە، کە خاوەنی نەمرییەکی هەمیشەییە (بوقادی، سلوم، 2018 :43).

ئەم جۆرە لە چیرۆك وەك وروژێنەرێك سەیر دەکرێت بۆ وروژاندنی خەیاڵی منداڵ، وایلێدەکات لە ژینگەی چواردەوری خۆیدا بە خەیاڵ بدوێت، مەودای بیرکردنەوەی فراوانتر دەکات، بەڕادەیەك سنوری لۆژیکی ڕەفتاری منداڵ تێدەپەڕێنێت، منداڵ بە گوێرەی خەیاڵی ڕەفتار دەکات، منداڵ نازیندەکانی دەوروبەری بەکاردەهێنێت لەبری ئاژەڵ و باڵندەو بونەوەرکانی تر، بەهیچ شێوەیەك مامەڵە لەگەڵ کات و شوێندا ناکات، ئەم جۆرە لە چیرۆك هۆکارە بۆ گەشەکردنی وزە و داهێنان لای منداڵ، ئەمەش وادەکات پەیوەندییەکی پتەو لەنێوان خەیاڵ و داهێناندا دروست بکات، ئەم جۆرە لە چیرۆك بۆ منداڵان تایبەتکراوە لە سنورێکی دیاریکراودا لەشێوەی ئەفسانە بۆ منداڵان، بە ئامانجی گەشەپێدانی بیرکردنەوە و خەیاڵی منداڵ (حیفان، 2012 :163-164).

ئامانج لە دانانی ئەم جۆرە چیرۆکە بۆ منداڵان، بریتیە لە گەشەپێدانی خەیاڵی منداڵ لە چوارچێوەی دونیای منداڵی و قۆناغەکانی تەمەنی منداڵ، پێویستە لە چوارچێوەی مەرج و پێوەری تایبەتیدا ئەم جۆری چیرۆکانە بنوسرێن بەبێ هیچ زیادەڕەویەك، بەشێوەیەك ڕاستی ڕوداوەکان لەگەڵ توانای بیرکردنەوەی منداڵدا گونجاوبێت، نابێت پچڕاندن لەنێوان خەیاڵ و ڕاستی لای منداڵ لەم جۆرە چیرۆکەدا هەبێت (حیفان، 2012 : 164).

چیرۆکی خەیاڵی تیایدا عەقڵ چارەسەری ڕوداوەکانی ڕاستی و خەیاڵی دەکات، نمایشی ئەو پاڵەوان و کەسێتیانە دەکات کە تواناو لێهاتوویەکیان هەیە لە توانای مرۆڤ بەدەرە، ئەمەش وا لە منداڵ دەکات کە ڕۆشنبیریی بەرامبەر بە ڕوداوەکان چارەسەر بکات، چیرۆکی خەیاڵی لە واقیعی منداڵەوە نزیکە، چونکە منداڵ ڕاستەوخۆ لە جیهانی خەیاڵدا دەژی، ئەوەی کە ژیانی دەبەستێەوە بە گرفتەکانی و چارەسەریشی بۆ دەدۆزێتەوە، تەنیا خەیاڵە، بۆیە چیرۆکە خەیاڵییەکانیش لە ڕەفتار و هەڵسوکەوتی منداڵەوە زۆر نزیکە، ئەمەش کاریگەریی تەواو لەسەر منداڵەکە دروست دەکات (بریغش، 1996 :212).

### 4. چیرۆکی پاڵەوانەکان

ئەم جۆرە چیرۆکانە باس لە ئازایەتی و جەربەزەیی دەکەن، دەکەونە چوارچێوەی چیرۆکی پاڵەوانێتی، ئەم جۆرە چیرۆکەش لە نێو منداڵاندا زۆر بڵاوبوەتەوە و بایەخێکی زۆری پێدەدەن، هەندێك لەو چیرۆکانەش ڕاستەقینەن، وەك ئەوانەی باس لە پاڵەوانێتی گەلێك یان کۆمەڵێك یان مرۆڤێك دەکەن لە ڕوبەڕوبونەوەی مەترسییەك، یان ئەو چیرۆکە پۆلیسیانەی کەوا ڕوداوەکانیان باس لە تاوانێك دەکات یەکێك یان زیاتر ئەنجامیداوە، پۆلیس تیایدا ڕۆڵی ئازایانە دەبینن لە پێناو بەجێگەیاندنی ئەرکی سەرشانیان لە ڕاوەدوونانی تاوانباران و دەستبەسەرداگراتنیان، پاڵەوانەکەشی بەزۆری ئەو منداڵانەن کەوا یارمەتی پۆلیس دەدەن و هەوڵدەدەن تۆمەتباران بدۆزنەوە، ئەمەش بێگومان لەڕێگەی ئەنجامدانی زنجیرەیەك ڕوداوەوە دەبیت، کەوا چارەسەری گرێی چیرۆکەکە دەکەن (صبري، 2010 :137).

چیرۆکی پاڵەوانەکان، بەهۆی ئەو کاریگەریەی کە هەیەتی لەسەر منداڵان، چەندین شێوازی جۆراوجۆر لە خۆ دەگرێت و سەرجەمیشیان خۆی لە هێز و توانای لەڕادەبەدەردا دەبینێتەوە، وەك ئازایەتی ڕاستی، زیرەکی، سەرکەشی ..... هتد (الهيتي، ب.ت :155).

چیرۆکی بەرگریی وەك یەکێك لە جۆری چیرۆکەکان و چیرۆکی منداڵان بە تایبەتی دەکەونە چوارچێوەی چیرۆکی پاڵەوانیەتییەوە، بەڵام چیرۆکی بەرگری بەشێوەی چیرۆکە پۆلیسیەکان لە باسکردنی خەیاڵدا زۆر سەرکەوتوونین، بەڵکو زیاتر ناوەڕۆکێکی مەبەستدار و واقعی لە خۆ دەگرێت، وەکو ئەو چیرۆکانەی دڵگەرمی منداڵان دەوروژێنن بەرەو کەسانێك یان ئایدۆلۆژیایەکی دیاریکراو (صبري، 2010 :138).

منداڵ بەشێوەیەکی سروشتی ئارەزوی لەم جۆرە چیرۆکانە هەیە، بەشێوەیەك کە لە چوارچێوەی ناوەڕۆکی چیرۆکەکە لادەدات، ئەویش بەپێی ئەو خەیاڵەی منداڵ بۆ ڕوداوەکان هەیەتی، بەشیوەیەك لە سروشتی ڕاستی ڕوداوەکان دەردەچێت، تواناکانی بەشێوەیەك دەرەخسێنێت کە لە کرداری مرۆڤ بە دور بێت (عطا، 1994 :77).

قۆناغەکانی تەمەنی منداڵی و گەشەکردنی لەیەکتری جیاوازن، لەبەرئەوە کاریگەرییەکانی چیرۆك لەسەریان جیاواز دەبیت، (ئارەزوی منداڵ لە قۆناغی تەمەنێکی دیاریکراودا ئارەزوی بۆ ڕۆڵبینینی پاڵەوانەکان دەچێت، ئەم قۆناغە پێیدەوترێت "قۆناغی منداڵی دواکەوتوو"، هەروەها پێشی دەوترێت قۆناغی ئەفسانەیی و پاڵەوانیەتی (شاوی، منماني، 2012 :28).

### 5. چیرۆکی زانستی

ئەو چیرۆکانەن کە دانەرەکانیان پەنای بۆ دەبەن تاوەکو لە نێوان بابەتەکانی خۆیان دەیانەوێت پێشکەشی دەکەن بەشێوەیەك لەگەڵ ئاڕاستەکانی سەردەمدا گونجانێك دروست بکەن، کەواتە ئەم جۆرە چیرۆکانە لە دەوروبەری باسێکی زانستیدا دەسوڕێنەوە، یاخود باس لە داهێنانێك دەکەن، ئەم جۆرە چیرۆکەش پشت بە سیمبوڵ و هێما دەبەستێت بۆ خستنەڕوی زانستە جۆراوجۆرەکان لە دیاریکردنی سروشت، زانستەکانی جوگرافیا، کەشوهەوا، گەردوون، سیماکانی ڕوەك ...هتد، ئەمەش مەبەستی سەرنجڕاکێشانی منداڵانە بۆ بابەتی زانستی بەشێوازێکی ناڕاستەوخۆ (احمد، 2017 :98).

چیرۆکی زانستی لە ڕیزی ئەدەبی منداڵاندا بە یەکێك لە هونەرەکانی ئەدەبی منداڵان دادەنرێت، بە تایبەت ئەو بنەمایانەی لەسەری بونیاد دەنرێت و دەنووسرێت، لەڕێگەیەوە منداڵ فێری هونەری ژیان و بونیادنانی کەسێتی دەبێت (عبدالسميع، 2016 :151).

چیرۆکی زانستی تێکەڵەیەکی سەرنجڕاکێشە لە خەیاڵ و ئەدەب و زانست، لە چوارچێوەی چیرۆکێکی سەرنجڕاکێشدا، لە کاتێکدا هاودژییەك لەنێوان زانست و ئەدەبدا هەیە، چونکە یەکێکیان پشت بە خەیاڵ دەبەستێت و ئەویتریان پشت بە تاقیکردنەوەوە و ئەزموون خوێندنەوەی واقیع دەبەستێت (صبري، 2010 :143).

لە وڵاتە پێشکەوتووەکانی ڕۆژئاوا چیرۆکی خەیاڵی زانستی یەکێکە لەو چیرۆکانەی لە ئەدەبی منداڵاندا بایەخێکی زۆری پێدەدرێت، بۆ شیکردنەوە و ڕاڤەکردنی بابەت و ڕاستیە زانستیەکان (صبري، 2010 :143)، لە دایکبونی ئەو چیرۆکانە پەیوەستە بە هاوکاریی و پەیوەندی نێوان نوسەر و زاناکانەوە ، لەڕێگەی ئەوانەوە لەدایك دەبن (قەرەداغی، 2000 :149).

**3-2-2 ئامانجی پەروەردەیی چیرۆکی منداڵان**

سەرجەم چیرۆکەکانی تایبەت بە منداڵان چەندین ئامانجی پەروەردەیی بەدیدەهێنن، کە بریتین لە:

1. خۆشەویستکردنی خوێندنەوە لای منداڵ ، بەشێوەیەك منداڵ بەرەو خوێندنەوە ڕادەکێشێت، کاتێك منداڵ بەرەو ئەم ئامانجە دەڕوات (خوێندنەوە) یارمەتیدەرێکە بۆ گەشەکردنی ئارەزوە هونەریی و ئەدەبییەکانی، لەگەڵ ئەوەشدا ئارامی دەخاتە دەرونی منداڵان و بیرو هزریان چوست و چالاك دەکات. (شاوي، منماني، 2012 :33)
2. هۆکارێکە بۆ دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ هەندێك سەرچاوە و زانیاریی بۆ منداڵ بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ.
3. تێرکردنی لایەنی ویژدانی و کۆمەڵایەتی و مەعریفی منداڵ و گەشە بە بەها کۆمەڵایەتییەکانی منداڵ دەدات بەشێوەیەکی ئەرێنی. (بابان و ئەوانی تر، 2016 :205)

4. هەندێك لە ئارەزوە شاراوەكانی منداڵ دەردەخات و ڕزگاری دەكات لەو هەڵچوونانەی كە منداڵ دووچاری گرژی دەرونی دەكاتەوە.
5. هانی منداڵ دەدات بۆ گوێگرتن و ئارەزوی جوڵە و چالاكی بۆ دروست دەكات، بەمەش دوری دەخاتەوە لە كەسێتیەكی چەقبەستوو.
6. هاوكار و یارمەتیدەرێكی باشە لە بونیادنانی كەسێتی منداڵ لەڕوی داهێنان و بیركردنەوە و دۆزینەوەی ڕێگەچارە بۆ گرفتەكان و ڕێكسختنی زمانەوانی.
7. هەستی چێژبینین لای منداڵ زیاتر دەكات، لەڕێگەی سەرنجدان و وردبونەوە لە ژینگەی دەوروبەری بە گەشبینانەو بە جوانی وێنای دەكات. (عبدالسميع، 2016 :152)
8. هۆكارە بۆ گەشەكردنی بیركردنەوەی ڕەخنەگرانەو داهێنەرانە، ئارەزویان بۆ ئامادەبونی داهێنانی هونەریی دروست دەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا هەستی جوانناسی لای منداڵان گەشە پێدەدات.
9. چیرۆكی منداڵان ئەگەر بەشێوەی تۆماركراو بێت یان بەشێوەی نووسراو، هۆكارە بۆ ڕاستكردنەوەی ڕەفتاری منداڵ و گەشەكردنی كەسێتی. گەشەی پەروەردەیی جوانناسی لای منداڵ زیاد دەكات. (بوقادي، سلوم، 2018 :38)
10. هەروەها لەڕوی زمانەوانیەوە یارمەتیدەرە بۆ منداڵ لەڕوی:

أ. هونەری دەربڕین و پەیوەندی لای منداڵان زیاد دەكات.

ب. یارمەتیدەرە بۆ تێگەیشتنی وشە ڕوتەكان بە بەكارهێنانی دوبارەكردنەوەی ڕوداوەكانی ناو چیرۆكەكە.

ج. خەیاڵی منداڵ دەوروژێنێت.

د. توانای زاڵبونی بۆ دروست دەكات لە وتنی گوفتاری نوێ و ڕاستڕەوی دەربڕینەكانی.

ه. كردارە عەقڵیەكانی وەكو زیرەكی و لێهاتوویی عەقڵ، كە مەبەست لێی (زمان و درككردن)ە گەشە پێدەدات، هەروەها لێهاتووییە بەدەستهاتووەكان زیاتر گەشە دەكەن وەك (چێژبینین، داهێنان). (الساموك، الشمري، 2005 :255)

**4-2-2 ڕەگەزەکان لە چیرۆکی منداڵاندا**

لە گرنگترین ئەو ڕەگەزانەی چیرۆکی منداڵانی لێپێکدێت وەك بنەمایـەکی سـەرەکی و شـێوە و ڕوخسارێکی هونەری پێدەبەخشێت بریتین لەمانەی خوارەوە:

1. **بیرۆکە:**

هەڵبژاردنـی بیـرۆکەی چیـرۆک، بە هەنگـاوی یەکەمـی چیـرۆک دادەنرێـت، پێویسـتە لە هەڵبژاردنـی بیـرۆکەی چیرۆکـدا، تایبەتمەنـدییە دەروونیـەکـان و سـۆزداری و ئاسـتی توانـای وەرگرتن و تێگەیشتن و گەشەکردنی قۆناغەکانی منداڵێتی لەبەرچاوبگرین (شوان، 2015).

بیرۆکە ئەو پەیامە دەردەخات کە چیرۆك نووسەکە دەیەوێت لەکارێکی هونەری جواندا بۆ منداڵانی بخاتەڕو، بابەتەکە لەگەڵ ڕەگەز و پایەکانی تری چیرۆکەکەدا دەکاتـە هـەوێن، بەسـەر هەموویانەوە زمان دەسپێکی هونەری ڕەنگینیان لێ دروست دەکـات (هـەورامی، 2005 :77). پێویپستە یەك جۆر لە بیرۆکەی تێدا بخرێتـە ڕو، چونکـە ( ئەگـەر هـاتوو کۆمـەڵێك بیرۆکـە لـە چیرۆکێکی منداڵانـدا بخرێتـە ڕو لـە بـەهاو بایـەخی بیرۆکـە سـەرەکییەکـەی کـە چیرۆکەکـەی لێپێکهاتووە کەمدەکاتەوە (حسن، 2005: 132).

هەروەها لەو ڕاسـتی و بەڵگانـەی کـە نوسـەر دەیـەوێت بەرجەسـتەیان بکـات بیانخاتـە ڕو لەمیانەی ڕوداوە کەسێتییەکانەوە، دەیەوێت بۆچوونی تایبەتی خۆی لەبارەی ئەوەوە بخانەڕو، بەمەش بەشداری لە ڕۆشنکردنەوەی ڕێگا بەرەو چارەسەرکردنی ڕاست و دروست بۆ ئەو بابەتە دەکات، لە هەمانکاتدا بیرۆکە بوار بە نوسەر دەدات کاریگـەریی لەسـەر مـرۆڤ دروسـت بکـات، بتوانێت بگاتە ئەو ئامانجەی لەپشت نووسین و نمایشی ئەو دەقە یان ئەو چیرۆکەیەوەیە، جـا ئەو ئامانجەش هونەری یان ڕەوشتی یان هەر جۆرێکی تر بێت (ئەحمەد، 2018 :38).

2. **بابەت:**

بابـەت لـە چیرۆکـی منداڵانـدا بریتیـە لـە بنەمایـەکی سـەرەکی کـە بونیـادی هونـەری تێـدا دروست دەکرێت، ئامانجێکە لە ئامانجەکانی چیرۆك نووسین، خۆی لـە ڕوداوە مێژووییـەکان و کۆمەڵایەتییەکان و زانستیەکان و ئاینیەکان و ...هتد)دا دەبینێتەوە (عبدالفتاح، 2000 :50).

بابەت لە چیرۆکی منداڵدا بە بڕبڕەی پشت دادەنرێت، لەبەرئەوە پێویستە لەکاتی دانانی بابەتی هەر چیرۆکێك و ڕوداوەکانی بابەتی بونی لەبەرچاو بگیرێت لە ئاڕاستەکردن و ئامانجی پەروەردەیی بۆ منداڵ، لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە ناوەڕۆکی هەر چیرۆکێك بنەمای بونی ڕاستگۆیی بە تەواوی پیادەکرابێت، بەشێوەیەك کاتێك کە منداڵ دەیخوێنێتەوە یان گوێی لێدەبێت کاریگەریی لەسەری دروست بکات (اسماعیل، 2004: 123).

**3. گرێ:**

گرێ یان گرێچن پرۆژەی ڕێکخستنی ڕوداوەکانە بەشێوەیەکی هونەری، واتە کاتێك چیرۆکنوس لە چیرۆکەکەیدا باس لە ڕوداوەکان دەکات، باشتروایە بە بەردەوامی و جموجوڵیان پێبکات و بە شیوەیەکی هونەریانە بیانچنێت، بەمەش ڕوداوەکان بەرەبەرە گەورە دەبن تاوەکو دەگەنە ترۆپك، بەمەش دەوترێت گرێ یان گرێچن، لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە گرێ لە ئەدەبی منداڵان و چیرۆکی منداڵاندا ئاڵۆز نەبێت (صبري، 2010: 94).

گرێ یان داڕشتن و بنیاتنان، بە پێکهاتەی سەرەکی چیرۆک دادەنرێت، دەبینین لە زۆر چیرۆکدا بیرۆکەی چیرۆکەکە جوان و بەهێزە، بەڵام داڕشتنەکەی لاوازە، چیرۆکنووس بیرۆکەی چیرۆکەکەی بەسەر زنجیرەیەک ڕوداو و بەسەرهاتدا دابەش دەکات، کە سەرجەم بەشەکانی بە شێوەیەکی لۆژێکی پێکەوە گرێدەدات و بەرەو لوتکەی بابەتەکە هەنگاو دەنێت، ئینجا هەنگاو بە هەنگاویش بابەتەکە بەرەو کۆتایی دیاریکراو دەبات و گرێی چیرۆکەکە دەکاتەوە، پێویستە ئەنجام و کۆتایی چیرۆکەکانی منداڵان، بە خۆشی و سەرکەوتن و رازیبون و هیوابەخشین کۆتاییان بێت، بەڵام هەندێ لە چیرۆکنووسەکان، هێندە بایەخ بە کۆتایی چیرۆکەکانیان نادەن، لەو ڕەوەوە دەڕوانن، کە یاساکانی ژیان و کارەکان هەمیشە لە تازەبونەوەدان، کۆتاییان نیە (شوان، 2018).

**4. کەسێتییەکان:**

کەسێتی ڕاست و دروست، خاڵیکی ترە لە خاڵەکانی چیرۆکی باش، چیرۆکنوسی بەهرەدار ئەوەیە بتوانێت بە وردی کەسێتییەکان وێنا بکات، بە جۆرێك لەگەڵ ڕەگەز و بەشەکانی تری نێو چیرۆکەکە بگونجێنێت و کارەکتەری ڕاستەقینەش بە خوێنەر یان گوێگران بناسێنێت، واتا

خوێنەر یان گوێگر ڕاستگۆییان تێدا ببینێتەوە، لەگەڵیاندا هەست بە بونی ژیـان بکـات، کەواتـە نوسـەر چەنـد لێزانانـە وێنـەی کەسـێتی بکێشـێت، چەنـد هونەرمەندانـە ڕوداوو بچنێـت و پەیوەندییـەکی هـارمۆنی لـەنێوان کەسێتی و ڕوداوەکانـدا بەرجەسـتە بکـات هێنـدەش زیـاتر دەتوانێت سەرکەوتن بەدەسـت بهێنێـت، چونکـە کەسـێتی و ڕوداو وەك دوو ڕەگـەزی گرنـگ و بنچینەیی، ڕۆڵێکی کاریگەر لەبەرهەمهێنانی هەموو چیرۆکێکدا دەبینن (حسن، 2005 :25).

لە چیرۆکی منداڵاندا کەسێتی دروسـت، ئـەو کەسـێتیانەن کـە منـداڵان ڕازی بکـەن بـەوەی ڕاستەقینەن یاخود هاوتای ڕاستیەکانن، جا ئەو کەسێتیانە مرۆڤ بن یان ئاژەڵ یـان ڕوەك یـان بێگیان، یان کەسێتی نێو ئەفسانەکان بن، یاخود هە رکەسێتییەك بـن کـە لـە جیهـانی منداڵانـدا خۆشەویستن (صبري، 2010 :101).

دەکرێـت لـە ناوچیرۆکەکانـدا بـەم شـێوەیە بـاس بکـرێن "نوانـدنی کەسـانێکە لـە نـەوەی ئادەمیزاد، کە هەمیشە بایەخێکی گەورەیان لە چیرۆکدا هەیەو بە زۆری بە گرنگترین ڕەگەز لـە ڕەگەزەکانی چیرۆك دادەنرێن، هەتا ئەگەر ئـەو کارەکتەرانـە گیانـدارانیش بـن، ئـەم گیاندارانـە هەمیشە وێنەی کەسانێك دەنوێنن یان لەجیاتی سیما مرۆڤیەکان بەکاردێن (ئۆلینبێرند، لویس، 2003 :125).

کەسێتی لـە چیرۆکـی منداڵانـدا دەبێـت گونجـاوو ئاشکرا بـن، بـە ئاسـانی جیابکرێنـەوە و سەرنجڕاکێش بـن، ئـەو کارەکتەرانـەی چیرۆکنـوس هەڵیانـدەبژێرێت، منـداڵان حـەزی لێبکـەن، لەگـەڵ قۆناغـەکانی گەشـەی منـداڵ و ئاسـتی بیرکردنـەوەیان بگونجێـت، ئاشـکراش بـن، واتـا بەرجەستەکراوو هەستپێکراوبن، بـە جۆرێـك بـۆ منـداڵ گـران نـەبێت لـە خـەیاڵ و ئەندێشـەی خۆیدا، وێنەکەی بەهەمان شێوە و خاسیەت و ڕەنگەکانیەوە بکێشێ، نابێت کەسێتییەکانی ناو چیرۆکەکە ژمارەیان زۆر بێت یان خەسڵەتیان لێك نزیك بێت، یـاخود ناویـان لێـك نزیـك بێـت، بـەڵکو دەبێـت هـەر کەسـێتییەك تایبەتمەنـدی و جیاکـەرەوەی خـۆی هـەبێت، تـاوەکو منـداڵان تێکەڵی یەکتریان نەکەن (نجیب، 1968 :80).

یەکێك لە بنچینەی هەرە گرنگی نووسینی چیـرۆك و چیرۆکـی منـداڵان، دەستنیشـانکردنی کەسـێتییەکانی نـاو چیرۆکەکەیـە، دەبێـت لەگـەڵ سـەردەمدا بیگونجێنێـت، چونکـە ئەگـەر

چیرۆکنوس ناوی کەسێتییەکانی ناو چیرۆکەکەی لەگەڵ سەردەمدا نەگونجان، ئەوا هەر زوو نەشارەزایی خۆی ڕادەگەیەنێت. (عارف، 1970 :11)

**5. کات و شوێن:**

کات لە هونەری چیرۆك نووسیندا بەپێی چەند دەستورێکی تایبەتی، دەبنە چوارچێوەیەك بۆ کەسان و کارەسات و ڕوداو و بەسەرهاتەکان (عارف، 2000 :278). هەروەها شوێن بریتیە لەو ڕاستیە کۆمەڵایەتیەی چیرۆکنوس هەڵی دەبژێرێت و ڕوداوی چیرۆکەکەی تێدا دەهۆنێتەوە، یان پاڵەوانی چیرۆکەکە لەم شوێنەدا ژیان دەباتە سەر (ئەحمەد، 2006 :77).

کات سەبارەت بە منداڵ و چیرۆکەکانیان، تاڕادەیەك جیاوازی بە خۆیەوە دەبینێت، چونکە منداڵ لە قۆناغی ساڵەکانی سەرەتادا تێگەیشتنی تەواوی ئاشکرای بۆ کات نیە، بەڵام هەستکردنی بۆ ڕەگەزی شوێن باشترە، لەبەرئەوە چیرۆکنوسەکان زۆرجار دەستەواژەی (هەبو نەبو، لە دێر زەمان، کەس لە خودا گەورەتر نەبو) بەکاردەهێنن (صبري، 2010 :110).

شوێنیش ئەو ڕاستیە کۆمەڵایەتیەیە، کە چیرۆکنوس هەڵیدەبژێرێت، تا ڕوداوەکانی چیرۆکەکەی تێدا دروستدەکات، یان ئەوەتا کەسێتی و پاڵەوانەکانی چیرۆکەکە لەم شوێنە ژیان دەکات، بۆیە گەڕانەوەی چیرۆکنوس بۆ ژیانی منداڵی بەشێکە لە دووتوێی دەستنیشانکردنی ئەو ناوچانەی منداڵ لێی دەژی، ئەگەر شوێنەکەش لەلایەن نوسەرەوە بە خەیاڵ دروست بکرێت، دەبێت نزیك بێت لە ژیانی منداڵەوە یان ئەوەتا بەشێك بێت لە ژیانی منداڵ (احمد، 2006: 77-78).

ئەو شوێنەی بۆ منداڵ گونجاوە لەگەڵ قۆناغەکانی ژیانیدا، بریتیە لە قوتابخانەو باخچەو دارستان و سەر درەختەکان، بەڵام لەگەر لەو ژینگە تایبەتیەی خۆی ژینگە و شوێنێکی تری بۆ فەراهەم بکرێت لەناو چیرۆکەکەندا، وەك شوێنی چۆڵ و ئەشکەوت و چیا بەرزەکان و ....هتد، ئەوا منداڵ پێویستی بە ئەزموونێکی فراوانتر و عەقڵێکی پەرەسەندوتر دەبێت، ئەمە ئەو خاڵەیە کە چیرۆکی منداڵان و گەورەکانی پێ جیادەکرێتەوە، ڕوداوەکان پەیوەست بە بارودۆخ و دابونەریت و پرەنسیپە تایبەتییەکانی ئەو کات و شوێنەی ڕوداوەکەی تێدا ڕودەدات، پەیوەست بونیش بە هەموو ئەمانەوە بۆ زیندویی چیرۆکەکە پێویستە، کەواتە ئەو چیرۆکەی

باس لە شوێنێکی دیاریکراو دەکات بۆ منداڵ، دەبێت ڕاستگۆیانە باسی لێوە بکات (الکیلاني، 1998 :69) .

**6. گێڕانەوە:**

چیرۆکنوس بۆئەوەی ڕوداوەکان بەیەکەوە ببەستێتەوە و کارەکتەرەکانی ئاشکرا بکات، لایەنە هونەریەکانی دەق پێکەوە گرێبدات و جۆرە جادویەك بە چیرۆکەکەی ببەخشێت، تا لەڕێگەیەوە گوێگر بۆ چیرۆکەکە کێش بکات، لەسەرو هەموشیانەوە جۆرێك لە متمانەو باوەڕ بە بەرامبەر ببەخشێت، دەبێت ڕەگەزی (گێڕانەوە) لە چیرۆکەکەیدا بەرجەستە بکات. (صبري، 2010 :112)

گێڕانەوە یەکێکە لە بونیادە سەرەکییەکانی دەق، بەشێوەیەکی ئیستاتیکی (جوان) دەقەکە بەڕێوە دەبات و لایەنە هونەرییەکانی دیکە پێکەوە گرێ دەدات، ئەمە جگە لەوەی ڕوداو و هەڵوێستەکان لە وێنەیەکی ڕاستی بۆ وێنەیەکی زمانەوانی دەگوازێتەوە بە جۆرێك کە (گوێگر یان خوێنەر) وا هەستبکات ئەم ڕوداوە و هەڵوێستانە دەبینێت (هادی، 2003 :102).

لە چیرۆکی منداڵاندا دانەر بەهۆی ڕەگەزی گێڕانەوەوە دەتوانێت کەسەکان و ڕوداوەکان بەشێوازێکی ڕاستگۆیانە و لە چوارچێوەیەکی هونەری جوانکاریی بە منداڵان بناسێنێت و سەرنجی منداڵان بۆ چیرۆکەکەی ڕابکێشێت، منداڵانیش لەنێو خۆیاندا ئەو کارانەی کردوویانەو ئەو بابەتانەی بینیویانە بە گێڕانەوە بۆ یەکتری باسی دەکەن، لەبەرئەوە لە چیرۆکدا ڕەگەزی گێڕانەوە تام و چێژی تایبەتی خۆی هەیە بۆ منداڵان (صبري، 2010 :112).

**7. گفتوگۆ:**

بریتیە لەو قسەو وتوێژە جۆربەجۆرانەی کە سێتییەکان لەنێوان خۆیاندا ئاڵوگۆڕی دەکەن بە کارێکی گرنگ دەژمێردرێت بۆ سەرکەوتنی چیرۆك، چونکە بنەمایەکی سەرەکییە لە بنەکامانی بینای هونەری چیرۆك، هەستێکی زیندوو دەداتە چیرۆکەکە، ئەو گفتوگۆیەش چیرۆکنوس بەکاریاندەهێنێت، دەبێت بە شێوازێکی جوان بخرێتە ڕو، بە جۆرێك لەگەڵ تەمەن و عەقڵی منداڵاندا بگونجێت، وشەو دەستەواژەی ئاڵۆزیان تێدا نەبێت، کە ببنە مایەی ئەوەی

منداڵان لێی تێنەگەن و توشی بێزاری ببن، لەگەڵ ئەمەش دەبێت گفتوگۆیەکان سوود بە منداڵان بگەیەنن لە هەموو ڕوویەکەوە (صبري، 2010 :116).

گفتوگۆ لە چیرۆکی منداڵاندا یارمەتی دەرخستنی بیرۆکەی چیرۆك دەدات و ڕوداوەکانی بەرجەستە دەکات و گوزارشت لە ناخی کارەکتەرەکان دەکات، واتە بە یەکێك لەو شێوازانە دادەنرێت کە نوسەر پشتی پێدەبەستێت بۆ وێناکردنی کارەکتەرەکان، وا لە نوسەر دەکات بەڕونی بتوانێت کارەکتەرەکان وێنا بکات، چونکە لەسەرەتادا کارەکتەرەکان زۆر ڕون و ئاشکرا نین، بەڵام لە میانەی گفتوگۆ و ئەو وتوێژانەوە لەناو چیرۆکەکەدا زیاتر ئاشکرا دەبن، هەروەها گفتوگۆ زیاتر سەرنجی منداڵان بۆ چیرۆك ڕادەکیشێت، کاتێك منداڵ دەبینێت کارەکتەرەکانی چیرۆکەکە لەگەڵ یەکتردا گفتوگۆ و ململانێ دەکەن، هەروەك چۆن ئەمە لە هەڵوێستەکانی ژیاندا لە نێوان کەسەکاندا بەدیدەکرێت، منداڵانیش بە هەمان شێوە کاردانەوەیان لە بەرامبەر ئەم گفتوگۆیانە دبێت(قناوي، 1990 :156).

**8. شێوازی خستنەڕو:**

بریتیە لە هەڵبژاردنی نوسەر بۆ وشەو پێکهاتەکانی لە دروستکردنی ڕستەو برگەدا بە شێوەیەکی دیاریکراو، تاوەکو ئەدەبێك پێشکەشی خوێنەر بکات، شێوازی چیرۆکنوسی باشیش بریتیە لە شێوازی گرێژنی گونجاو ڕێك لەگەڵ بابەت و بیرۆکەو کارەکتەرەکانی نێو چیرۆکەکە، واتە چیرۆکنوسەکە کەشوهەوای چیرۆك دروست دەکات و هەست و سۆزەکان نیشاندەدات (صبري، 2010 :117).

جیهانی منداڵان جیهانێکی جۆراوجۆرە، بە جۆراوجۆری قۆناغەکانی تەمەنی، لەبەرئەوە پێویستە شێوازێکی گونجاو لە خستنەڕوی چیرۆکی بۆ فەراهەمبکرێت، لەگەڵ ئاست و تواناو شارەزاییەکانی منداڵدا گونجاوبێت، لەبەرئەوەی پێویستە ساڵانی تەمەن و قۆناغی گەشەی منداڵ لەبەرچاو بگیرێت لە شێوازی بەکارهێنانی وشەو گوزارشتی ناو چیرۆکەکان، مەرجی ڕەگەزی شێواز لە چیرۆکی منداڵاندا ئەوەیە نوسەر دورکەوێتەوە لە بەکارهێنانی ئەو وشەو زاراوە بیانیانەی لەڕوی تێگەیشتنەوە بۆ منداڵان گران و قورسن، لەگەڵ ئەوەشدا بەکارهینانی هەندێك لە وشەی ئاڵۆز بەرێژەیەکی کەم گونجاوە تا منداڵ توانای ناسین و تێگەیشتن و

بەدەستهێنانی شارەزایی لەگەڵیدا هەبێت و بەهۆیەوە شارەزایی زمانەوانی زۆربێت و گەشە بکات (شاوي، مناوي، 2012 :18).

ئەو شێوازەی لە چیرۆکەکاندا بەکاردەهێنرێت بە باشترین هۆکار دادەنرێت کە لەڕێگایانەوە ناوەڕۆکی جۆراوجۆر پێشکەش بە منداڵان دەکرێت، بۆیە پێویستە لەسەر چیرۆکنوس لەپێش هەموو شتێك هەوڵی ئەوە بدات ئەو وشەو گوتانە بەکاربێنێت کە سادەو ساکارن و منداڵ لێیانتێدەگات، واتە بەکارهێنانی وشە بەرجەستەکان زیاتر لە وشە ڕوتەکان، مەبەستمان لە وشە بەرجەستەکان ئەو وشەو دەستەواژانەن کە منداڵ لەڕێگەی یەکێك لە هەستەکانیەوە (بینین، بیستن، چێژ، دەستلێدان، بۆنکردن) دەتوانێت ڕاڤەیان بۆ بکات، چونکە منداڵان زیاتر لەڕێگەی هەستەکانیانەوە دەتوانن جیهانی دەرەوبەری خۆیان بناسن، لەوەی لەڕێگەی وشەکانەوە بیناسن. (الشاروني، 1986 :218)

**9. کۆتایی:**

کۆتایی شێوەیەکە لە کاری هونەریی کە کۆتایی بە چیرۆك دێت تێیدا، دەکرێت ئەو کۆتاییە کراوە یان داخراو بێت، کۆتایی چیرۆکەکەش دەبێت چارەسەری ئەو گرێیە بکات کە نوسەر لەناوەڕۆکی بابەتەکەدا دیاریکردووە، هەروەها ئەنجامی ئەو ململانێیانەش بخاتەڕو، کە چیرۆکنوس دروستیکردون (بوقادي، سلوم، 2018 :40).

### 5-2-2 ڕەگەزی چیرۆك لەڕوی تەکنیکەوە

ڕەگەزەکانی چیرۆکی منداڵان لەڕوی تەکنیکییەوە (صبری، 2010 :119 -123) دیاریکردووە:

1. ناونیشان: ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێت لە سەرنجڕاکێشانی خوێنەر بۆ چیرۆکەکە، بە تایبەت ناونیشانی گونجاو و کاریگەر، منداڵ هاندەدات بە زووترین کات دەست بە خوێندنەوەی چیرۆکەکە بکات تاوەکو چێژی خۆی لێ وەربگرێت.
2. فۆنت: فاکتەرێکی گرنگە لە سەرنجڕاکێشانی منداڵ بۆ چیرۆکەکە، چونکە ئەگەر ئەم ڕەگەزە لە چیرۆکدا پشتگوێخرا و بایەخی پێ نەدرا، ڕەنگە ببێتە هۆی دورکەوتنەوە و بێزاربونی منداڵ لە چیرۆکەکە.

3. وێنەو نیگار: وێنە یەکێکە لەو هۆکارانـەی کاریگەرییـەکی زۆری بـۆ سـەر منداڵ هەیـە، منداڵان هەر لەسەرەتای ژیانیانـدا بـۆ گوزارشـتکردن لـە هەسـت و سـۆز و هـەڵچوون و پێداویسـتییەکانیان، پـەنایان بـۆ نیگارکێشـان بـردووە، بـە تایبـەتی ئەوانـەی گرفتـی قسـەکردنیان ئاسـتەنگ بـوە لەبـەردەم دەربڕینـی ئـەوەی لـە ناخیاندایـەو ویسـتویانە بەئەنجامی بگەیەنن، لەبەرئەوە هەر لە کۆنەوە وێنەو نیگـار لای منـداڵان خۆشەویسـت بوە، پێویستە کتێب و نامیلکەی منداڵان پیش وشەکان پشت بە وێنەو نیگار ببەستن.
4. ڕەنگ: یەکێك لەو هۆکارانەی دەبنە مایەی سەرنجراکێشانی منداڵان، بریتیە لە ڕەنگ، لە کتێب و نامیلکەی چیـرۆك ئـامێزی منداڵانـدا نابێـت ڕەگـەزی ڕەنـگ فـەرامۆش بکرێـت، چونکە زانایانی دەروونناسـی بـە تایبـەت ئەوانـەی لەسـەر ڕێبـازی دەرونشـیکاری دەڕۆن جەخت لەسەر گرنگی ڕەنگەکان  لەسەر دەرونی منداڵ دەکەنەوە.
5. شێوە و قەبارەی کتێبی چیرۆکی منداڵان: ئەو کتێبە یان نامیلکەیەی چیرۆکـی منـداڵان لە خۆ دەگرێت، لە ڕوی شـێوە و قـەبارەوە دەبێـت چەنـد تایبەتمەندییـەکی تێـدا بێـت، تاوەکو ئارەزوی منداڵانی بکەوێتە سەرو سەرنجیان بۆ چیرۆکەکە ڕابکێشێت.

**2-2 چەمکی بەها**

بەها بەو هەموو بابەتانە دەوترێت، کە شایەنی بایەخپێدانن و گرنگن لـەڕوەکـانی مـاددی و مەعنـەوی و کۆمەڵایـەتی و ئاکـاریی و ئـاینی و جوانیـەوە، هـەروەها بـەها ئـەو چەمکانەیـە کاریگەریی لەسەر ڕەفتاری مرۆڤ بەجێدەهێڵن و ڕاست و پەسەند دیاریدەکەن(بۆکانی، 2020 :60).

تێڕوانینی زانایان و بیرمەندان و فەیلەسوفان بۆ چەمکی بەها جیاوازە،پێدەچێت هۆکـاری ئـەم جیاوازیـەش بگەڕێتـەوە بـۆ جیـاوازی بیرکردنـەوە و پسـپۆڕییان، چونکـە بـەها زۆرتـرین گشـتگیریی لـە ئاڕاسـتەکرندا هەیـە، لەبەرئـەوە ناکرێـت بەشـێوەیەکی سـنوردار بابەتـەکانی دیاریبکرێـت، ئەمـەش وادەکـات بـەها ببێتـە پێکهاتەیـەکی ئامـاژە پێکـراوی ڕۆشـنبیریی لـەنێو ژینگەی کۆمەڵگە و مرۆڤدا، چونکە بـەها بـە پردێکـی پەیوەنـدی لـەنێوان کلتـور و ڕۆشـنبیریی کۆمەڵگەدا دادەنرێت، لەم ڕێگەیـەوە دەتوانرێـت پـەرە بـە پرۆسـەی پەرەپێـدانی کۆمەڵایـەتی بدرێت (نشواني، 2003 :480).

زۆرێك لە شارەزایان پێیانوایـە بـەها لـە كۆمـەڵێك ئاڕاسـتەو پێـوەر پێكهـاتووە، هەنـدێكی تریشیان پێیانوایە كە بەها كۆمەڵێك چالاكی ڕەفتاریە كە مرۆڤ پێی هەڵدەستێت، كۆمـەڵێكی تریش پێیانوایە کـە هـەردوو ئـەو ئاڕاسـتەیەی سـەرەوە بـۆ چـەمکی بـەها دروسـتەو هـەردوو ئاڕاستەكە بەیەكەوە كۆدەكەنەوە (زهران، 1995 :18).

بەهاكان كاریگەرییان بەسەر ڕەفتاری مرۆڤەوە هەیە، لەگەڵ ئـەو بەهایانـەی، کـە تـەنها بـە هەست و سۆزەوە ڕەنگدانەوەی بەسەر هەڵسوكەوتدا دەبێـت، هـەر ئەمانـەش جـۆری رەفتـارو مرۆڤ و كۆمەڵگە دیاریدەكەن، بۆئـەوەی لـە کاریگـەریی بـەها بگـەین لەسـەر رەفتـاری مـرۆڤ، دەبێت كاریگەریی ژینگە بەهەند وەربگـرن لـەو هەلانـەی دەیڕەخسـێنێت، یـان ڕێگـری دەكـات، لەگەڵ باوەڕبون بە كاریگەریی بەها بەسەر ڕەفتاری مرۆڤەكانەوە، ئەوا وروژێنـەرەكانی ژێنگـە لەو كاریگەرییە كەم دەكەنەوە. (صادق، رەحمان، احمد، 2020 :84)

هەر ڕەفتـارێكی مـرۆڤ خـۆی لەباشـزانینی رێبازێكـدا دەبینێـتەوە لەچـاو یەكێكـی تـردا). (غریب، 1983: 271)، بەها كۆمەڵێک پێوەر و بڕگەیە لەلایەن تـاكەوە لە ڕێـگەی کـارلێککردنی لەگەڵ دۆخ و ئەزموونە كۆمەڵایەتییەكان دروست دەبێـت، تـا لەڕێگەیـەوە بتوانێـت ئامـانج و ئاڕاستەكان بۆ ژیـانی خـۆی دیاریبكـات و هەڵبژێرێـت كە بە شایستەی بەكارهێنـانی تواناكـانی دەزانێت، بەهاكان لە ڕێگەی گرنگیپێدانـەوە بەرجەسـتە دەبـن، یـان ئاڕاسـتەكان، یـان ڕەفتـاری پراكتیكی یان زارەكی، ڕاستەوخۆ بێت یان ناڕاستەوخۆ (العاجز، 1999 :5).

بەها لە كۆمەڵێک یاسا و پێوەر لە گروپێكدا سەرهەڵدەدات، كە پێوەرێک بۆ بڕیاردان لەسەر كرداره ماددی و ئەخلاقییەكان دادەنێت، دەسەڵات و هێزێك دروست دەكات، كاریگەریی لەسەر گروپەكە هەبێت، بەجۆرێک كە دەبێـتە پێویسـتیەك بـۆ گروپەكـە، هەر دوركەوتـنەوە لێـی یـان لادان لە ئاڕاستەكانی دەبێتە دوركەوتنەوە لە بنەما و ئامانجی گروپەكە (احمد، 1986 :250).

لەبەرئەوە بەها ڕۆڵێكی گرنگـی لـە ژیـانی مـرۆڤ و كۆمەڵگـەدا هەیـە، لـە بەیەكگەیشـتن و كــارلێككردنی مــرۆڤ لەگــەڵ ژینگــەی دەوروبەریــدا بەدەســتدێت، لــەپێناو دەســتكەوتنــی بەرژەوەندییــەكانی كاتێــك بەرژەوەندییــەكان بەدەردەكــەون، بــەها كــارێكی ئاڕاســتەكراوو كـۆنترۆڵكراوی ڕەفتـاری مرۆڤـە، رۆڵ دەبینێـت لـە بەدەسـتهێنانی هاوسـەنگی كۆمەڵایـەتی و

دەرونـــی، بەوپێیـــەی بـــەها کاردەکـــات بـــۆ خـــاڵی بەیەکگەیشـــتن و لێکتێگەیشـــتن لـــە ئاڕاسـتەکردارییەکانی مرۆڤـدا، هاوبەشـە لـەنێوان ئەنـدامانی کۆمەڵگـەدا (ختاتنـة و اخـرون، 2010 :2011).

لەبەر ئەوەی چەمکی بەها یەکێکە لەو چەمکانەی توێژەران بۆ زۆربـەی بـوارە جیاوازەکـان دیاریـانکردووە، وەك فەلسـەفە پـەروەردە و ئـابوری و دەرونناسـی و کۆمەڵناسـی و پسـپۆڕی زانستەکانی تر، لەم نێوەندەشدا جۆرێك لە تێکەڵبون و شاراوەیی و تێڕوانین و بـەکارهێنان بـۆ ڕونکردنەوەی چەمکی بەها لە پسپۆڕییەکەوە بۆ پسپۆڕییەکی تر دروست دەبێت، ئـەم چەمکـە بەشـێوەیەکی جیـاواز لـە نێـو تـەنها پسپۆڕیەکیشـدا بـەکارهاتووە، ئـەو پەرتوکـە زانسـتیە مرۆڤناسـیانەی بـاس لـە بـەها دەکـەن دووپـاتی دەکەنـەوە یەکـەمجار وشـەی بـەها بـە واتـا فەلسەفیەکەی لەلایەن ئەڵمانیەکانەوە بڵاوکراوەتەوە بە تایبەت زانا (لوتز – Lotze). (رشـوان، 2002 :81)

لەســەرەتای گەشــەکردنی کۆمەڵگــە ســەرەتاییەکاندا مــرۆڤ هەســتی بــەو پەیوەندییــە توندەکردووە لەنێوان خۆیی و براکەی یـان کۆمەڵگەکـەی لـە ڕوبـەڕوبونـەوەی داواکارییـەکانی ژیانی ئەویش دوای جێگیربونی مامەڵەکردنی لەگەڵ زۆرێك لە کەسانی دەوروبەری و کۆمەڵگە جیاوازەکان، ئەمەش بوە هۆی دروستبونی مامەڵەو پەیوەندی لەنێوانیاندا بە تێپـەڕبونی کـات، مرۆڤ بە سروشـتی خـۆی سـووربوە لەسـەر بەدەسـتهێنانی مافـەکانی، ئـەو مامەڵەیەشـی لـەو پێنـاوەدا پەرەپێـداوە، ئەمـەش وایکـردووە کـە تێڕوانینـی بـۆ کەسـانی تـر جیـاواز بێـت، ئـەم جیاوازییەش وایکردووە بەها بۆ مرۆڤایەتی و ئەو مامەڵـە دابنێـت کـە بـەردەوام لەگـەڵی بـوە. (الصادق، 2009 :35).

لەبەرئـەوە بـەها بـە کۆمـەڵێك یاسـاو پێـوەری کۆمەڵایـەتی دادەنرێـت، کـە بوەتـە پێـوەری بڕیردان لەسەر جێبەجکردنی ئەرکەکان، جا ئەو ئەرکانە (مادی بن یـان مەعنـەوی)، کاریگـەریی لەسەر مرۆڤ و کۆمەڵ دروست دەکەن، چونکە خاسیەتی گشتگیریی هەیە، بـە واتـای لانـەدان دێت لە بنەمای کۆمەڵگەو ئامانج و بەها نموونەییەکانی کۆمەڵگەیە. (زکریا، 2002 :29)

کەواتــە بەهــا کــاریگەریی لەســەر ڕەفتــاری مــرۆڤ بەجێــدەهێڵێتو ڕاســتو پەســەند دیاریدەکەن (Baldridge, 1980: 105). مانا و پێگە و شوێنی پابەندبونی مرۆڤ دیاریـدەکات کە تاک خۆی هەڵیدەبژێرێت بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆی و لەگەڵ ئەو ژینگەیەی تێیدا دەژی کارلێـک بکات و پابەند بێت پێیەوە (العاجز، 1999 :5). بەها بە حاڵەتێکی عەقڵی و ویژدانی دادەنرێـت کە دەکرێت مرۆڤ فێری ببێت لەڕێگەی وروژێنەرەکانەوە، کـە خـۆی لـە بیروبـاوەڕ و هەسـت و ئاڕاسـتەو دەسـتکەوتدا دەبینێتـەوە، مـرۆڤ زۆر جـار بـە ویسـتی خـۆی یـان بـە پێچەوانـەوە ئارەزوی جێبەجێکردنی بەها دەکات، لەڕیگەی ئـەو وێناکردنانـەوە کـە بـەهۆی کـارلێکی لەگـەڵ ژینگــەی دەوروبــەری یــان کۆمەڵگــەوە بــۆی دروســت دەبێــت (حمــود، 2020 :143). ئــەم خەسڵەتانەی بەها وادەکات ئاڕاستەی ڕەفتاری مرۆڤەکانی کۆمەڵگە دیاریبکات، لە چوارچێوەی ڕۆشنبیرییەکی دیاریکراو یان کۆمەڵگەیەکی دیاریکراو لەڕێگـەی پەرەپێـدانی کۆمەڵایەتییـەوە دێتەدی و دروست دەبێت، مرۆڤەکان گرنگییەکی تایبەتی پێـدەدەن، لەسـەر بنەمایـەکی تـەواو کە ئامانجە تایبەتییەکان و گشتییەکان بۆ ئەو کۆمەڵگەیە بهێننەدی (جابر، 2004 :288).

### 2-2-1جۆرەکانی بەها

### 2-2-1-1 بەها لەڕوی گشتگیریی

1. بــەهای گشــتی: ئــەو بــەها بڵاوانــە دەگرێتــەوە کــە لــەناو کۆمەڵگــەدا بــڵاوە خــۆی لــە چوارچیـــــوەی کۆمەڵگـــــەدا دەبینێتـــــەوە و لـــــە ڕەفتارەکانـــــدا دەخرێتـــــە ڕو. (Fergusson,2008,pp184-196). ئەمانــە ئــەو بەهایانــەن لــە هــەمان بــاڕودۆخی جیـاوازیی ئـابوریی و کۆمەڵایـەتی و ئـاینی و سیاسـییەوە بڵاودەبنـەوەو وەك گرنگـی پابەنـدبون بـە ئـاین و بیروبـاوەڕ و پەرسـتن، بـەهاکانی ڕێکخسـتن و ڕێگـرتن لـە کـات پابەنــدبون بــە نەریتــەکانی ڕابــردوو ئــەم بەهایانــە کــار لەســەر یــەکێتی کۆمەڵــە یەکگرتووەکەی دەکەن. (ئیسماعیل، بابا، 2022 :15)
2. بەهای تایبەتی: ئەمانە ئەو بەهایانـەن چینێـك لـە چینێکـی تـر جیادەکاتـەوە، وەك ئـەو بەهایانەی چینی مامۆستا لەوانی تر جیادەکاتەوە، وەك بەها پەروەردەییەکان و بـەهای ئەکادیمی، کۆمەڵایەتی، هاوکاریی، کلتـوری و ئـاینی و هۆشـیاریی لـە گرنگـی ئـایین لـە ژیانـدا و ئـەم بەهایانـە کـار لەسـەر یـەکگرتوویی و وابەسـتەیی یـەکتری ئـەم پۆلـە و

پێشبینیکردنی ڕەفتاری خاوەنەکەی دەکەن، (ئیسماعیل، بابا، 2022 :15) ئەم جۆرە تایبەتە بە گروپێکی تایبەتی لە خەڵك و پەیوەستە بە کات و شوێنێکی دیاریکراوەوە (Fergusson,2008,pp184-196).

### 2-1-2-2 بەها لەڕوی ناوەڕۆکەوە

هەروەها دەکرێت بەها دابەشبکەین بە چەند جۆریکی دیکەوە بەپیی چەند بوارێك و لایەنێکی جیاواز، بریتین لەمانەی خوارەوە:

1. **بەهای ئاکاریی**

بەهای ئاکاریی بە یەکێك لە بەها گرنگەکان دادەنرێت بۆ مرۆڤ و هەمیشە لەسەرەوەی جۆرەکانی تری بەهاوەیە، بەهای ئاکاریی ئەو بەهایەیە کە مرۆڤ هەست بەوە دەکات دەبێت جێبەجێی بکات، واتا دەبێتە پێویستی لەسەر مرۆڤ بۆ جێبەجێکردنی، چونکە لەکاتی جێبەجێکردنی ئەم بەهایەدا مرۆڤ هەست بە ئارامی دەکات، چەند جۆرێکیش لە خۆ دەگرێت، وەك (دەستپاکی، ڕاستگۆیی، دڵسۆزی.... هتد)، لەسەرجەم کۆمەڵگەکاندا مرۆڤ هەست بە پێویستی بونی ئەم بەهایە دەکات، لەکاتی جێبەجێنەکردنیشیدا یان پەیوەست نەبون پێوەی مرۆڤ هەست بە لۆمەکردن و سەرزەنشتکردنی خۆی دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا بەهای ئاکاریی بە سروشتی خۆی زۆرجار پێویستییەو زۆرجاریش بە هەڵبژاردنی لای مرۆڤ، بەهای پەیوەست بون لای مرۆڤ وای لێ دەکات کە پەیوەست بێت پێوەی، ڕێزگرتنی موڵکی گشتی، ئەگەر مرۆڤیش پەیوەست نەبو پێوەی ئەوا دووچاری سزای کۆمەڵگە دەبێتەوە، بەڵام بەهای هەلبژاردن مرۆڤ هەست بە جۆرێك لە ئازادی دەکات لە ئەنجامدانیدا، پەیوەست نەبون پێوەی دووچاری سزای کۆمەڵگەی ناکاتەوە، وەك یارمەتیدانی هەژاران و هاوکاریکردنی کەسانی تر (صفية، مليكة، 2018 :58).

2. **بەهای ئابوری**

پەیوەستە بەو کارەی مرۆڤ گرنگی پێدەدات لە پێناو سوودێکی ماددی، یان دروستکراوێك، یان بەرهەمهێنراوێك، یان کۆکردنەوەی سامان، یان بەرهەمهێنان و کۆکردنەوەی سەروەت و سامان لەڕێگەی بازرگانیەوە (الهندي، 2001 :31).

مرۆڤ گرنگی بە بەهای ئابوری دەدات و ئارەزوی دەکات کاتێك سوود یان بەرژەوەندی تێدا دەستبکەوێت، ژینگەی چواردەوری بەکاردەهێنێت بۆ کۆکردنـەوە و دەسـتکەوتنی سـەروەت و سامان لەڕیگەی بەرهەمهێنان و بازاڕکردن و بەکارهێنانـەوە، ئـەو کەسـانەی ئـەم جـۆرە بەهایـە جێبەجێدەکەن و پیادەی دەکەن بە کـەسـانی سـەرمایەدار هـەژماردەکرێن، زۆرجـاریش بـەهای مادی بۆ ئەم جۆە کارانە دادەنرێت (صفية، مليكة، 2018 :59).

بەهای ئابوری خۆی لە بەرژەوەندی مرۆڤ و مـەیلی بـۆ هـەموو شـتێك، کـە سـوودی هەیـە بـۆیی دەگرێتـەوە، بـۆ بەدەسـتهێنانی ئـەم ئامانجـە جیهـانی دەوروبـەری وەك ئامرازێـك بـۆ بەدەسـتهێنانی سـامان و زیـادکردنی لـە ڕێگـەی بەرهـەمهێنان و بـەبازاڕکردن و بـەکاربردن و بەرهەمهێنانی پـارە بـەکاردەهێنێت، ئـەو کەسـانەی کـە ئـەم بەهایـەیان هەیـە بـە تێڕوانینێکـی کردەیی سوودگەرانە تایبەتمەندن(ئیسماعیل، بابان، 2022 :13).

### 3. بەهای کۆمەڵایەتی

بەها کۆمەڵایەتییەکان گرنگی مرۆڤەکان بۆ خەڵکانی دەوروپشتیان دەردەخات، کە ئـەوانی خۆش بوێت و ئارەزوی هاوکاری و یارمەتیدانیان دەکات، بەمەش تێربونێکی دەرونی لە خۆیدا دەبینێتەوە، ئەو کەسانەی کە ئەم بەهایەیان هەیە، بەوە جیادەکرێنەوە کە سۆزدارو هاوسـۆز و خزمەتگوزاریی کەسانی ترن (على، 2005 :27).

هەروەها بەها کۆمەڵایەتییەکان کۆمەڵێك بەهان کە مرۆڤ پێی جیادەکرێتەوە گرنگی بـە لایــەنی کۆمەڵایــەتی و لێهــاتویی و تواناکــانی دەدات بــۆ کــارکردن لەســەر پەیوەندییــە کۆمەڵایەتییەکانی، خۆبەخشانە خۆی بۆ خزمەتکردنی کەسانی تر تەرخان دەکات و مرۆڤ بەو توانایـە جیادەکرێتـەوە کـە هەیـەتی دەبەخشـێت لـە کـات و کۆشـش و مـاڵ و سـامانی بـۆ خزمەتکردنی کۆمەڵگـە، ئـەویش بـە ڕەفتـاری دۆسـتانەو بـەزەیی و سـەرنجڕاکێش (المعايطـة، 2010 :182).

ئەم بەهایە لەو مرۆڤانەدا دەردەکەوێت کە ژیانێکی کۆمەڵایەتی فراوانیان خۆش دەوێت و مەیلیان بۆ کەسانی تر هەیە، وەك چۆن مەیلی بۆ یارمەتیدانیان هەیە، لەم بەهایەدا دڵخۆشـیی دەرونی و کۆمەڵایەتی و هەروەها ڕازیبـونی خـۆی دەدۆزێتـەوە و ئـەم کەسـەش بـە ڕۆحێکـی

هاوبەشی گەورە تایبەتمەندە بە بەخشین و بەخشندەیی و میهرەبانی (ئیسماعیل، بابان، 2022 :13).

**4. بەهای سیاسی**

گرنگی مرۆڤ دەگرێتەوەبۆ دەستکەوتنی هێز، بۆیە دەكرێت بڵێین بەهای سیاسی لای مرۆڤ ئەوەیە، کە بەدوای دەستگرتن و زاڵبون بەسەر بابەتەکاندا دەگەڕێت (عبدالفتاح، 2001 :30).

بەو پێیەی بەهای سیاسی پەیوەندی نێوان دادوەر و تۆمەتبار دەخاتەڕو زانایان بەشێوەیەکی گشتی گرنگییەکی زۆری پێدەدەن، هەروەها تێڕوانین بۆ بەڕێوەبەردنی دیموکراتی و دیکتاتۆری دەخاتەڕو، هەروەها بەهای سیاسی خۆی لە ئازادی ڕادەربڕین و ئازادی هەڵبژاردن و دادوەریی و یەکسانی بۆ مرۆڤ و کۆمەڵگە و ڕێزگرتن لە یاسا دەستەبەرکردنی کار بۆ هاوڵاتیان وپاراستنیان (الخطیب، 2002 : 300).

بەواتای بەرژەوەندی مرۆڤ بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات و کۆنترۆڵکردن، بە ئامانجی کۆنترۆڵکردنی شت و مرۆڤەکان، لەلایەن مرۆڤەوە لەڕێگەی چالاکی سیاسی و کردەی سیاسی و چارەسەرکردنی کێشەکانی جەماوەرەوە دەربڕێت (ئیسماعیل، بابان، 2022 :13)

**5. بەهای ئاینی**

مەبەست لە بەهای ئاینی گرنگیدانی مرۆڤە یان ئارەزویەتی بۆ زانینی بابەتە نادیارەکان و هەست پێکردنیان (عبدالفتاح، 2001 :30)، یان پەیوەست بون و گرنگریدانی مرۆڤە بە بیروباوەڕ و فێرکارییە ئاینیەکان (الهندي، 2001 :31).

بەهای ئاینی لە زانینی بنەڕەتی مرۆڤ و چارەنووسی دەکۆڵێتەوە، هەروەها زانینی ئەو هێزە شاراوەی کە دەستیگرتووە بەسەر جیهاندا و جیهان بەڕێوە دەبات، بە تایبەت ئەو ژینگەیەی کە مرۆڤ خۆی تێدا دەژی، مرۆڤ هەوڵدەدات بەو هێزە نادیارە بگات، لەبەرئەوەی مرۆڤ هەوڵدەدات لە هەموو ڕوەکانەوە و لەڕێگەی فێربونەوە بگات بەم بەهایە (زهران، 1977 :134).

**6. بەهای جوانی**

لەگەڵ ئەوەی جوانی خۆی لە خۆیدا مانایەکی نادیاری و بەر بڵاوی هەیە، بەپێی هیچ پێوانەو دەستورێك ناناسرێت، هیچ یاساو ڕێورەسمێك نیە بەگوێرەی ئەوان دابنرێن و بخرێنە ڕو (میراودەلی، 2021 :25).

گرنگی مرۆڤ و ئارەزوی دەردەخات بۆ ئەو بابەتانەی جوانن لەڕوی شێوەوە یان هاوسەنگی و گونجاندنە، زۆرێك لە خەڵکی بەوە جیادەکرێنەوە ئەم جۆرە بەهایە لایان بریتیە لە هونەر، داهێنان، چێژبینین لە جوانی، دەرەنجامەکانی (علي، 2005 :26).

**سەبارەت بە جۆرەکانی بەها، توێژەران و شارەزایان چەندین جۆر بەهایان دەستنیشانکردووە، بەم شێوەیەی خوارەوە:**

1. بەهای ڕەها: ئەم جۆرە بەهایەکی سەربەخۆیە لەڕوی سنوری کات و شوێنەوە، بەهیچ جۆرێك ناوەندی یان ناوەندگیریی تێدا نیە، بە بەهایەکی هەمیشەیی و ماوەیی دادەنرێت، وەك خۆشەویستی بۆ خودا.
2. بەهای ڕێژەیی: ئەم جۆرە لە بەها پەیوەستە بە سنوری کات و شوێنەوە، هەروەها ئەو ژینگەیەی کە دەوری مرۆڤی داوە، بەڵام بەشێوەیەکی ڕێژەیی، یان ناوەندێکی هەیە کە گەشەی تێدا بکات، ئەم جۆرەش دەکرێت بە دوو جۆری ترەوە، وەك:

أ. بەهای مەبەستدار: لەڕوی ناوەڕۆکەوە بەهایەکی ئامانجدارە، مەبەست لێی مەبەستەکانی بونی مرۆڤە وەك (دروستکردن، خێر، جوانی...هتد).

ب. بەهای خۆڕسکی: کە بریتیە لە بەهای پەیوەستبون، سەرکەوتن، بەشداریکردن، بە یەکێك لە شێوازە باڵاکانی ڕەفتاری مرۆڤ دادەنرێت لەناو کۆمەڵگەدا. (خضر، 1988 :25)

**2-2-2 سەرچاوەی بەهاکان**

بۆ دەستکەوتنی بەها، چەندین سەرچاوە هەیە کاریگەریی لەسەر مرۆڤ دروست دەکات لە دەستکەوتنی بەهاکان بەپێی ناوەندی کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمە، گرنگترین سەرچاوەکانی بەهاش بریتین لە:

1. چوارچێوەی کلتوریی و دابونەریت کە مرۆڤ تێیدا دەژیی، ئەویش لە دروستکراوی کۆمەڵەو پێویستی مرۆڤەکانە.
2. ئەزموون، کە سەرچاوەی دروستکردنی بەهاکانە (صادق، رحمان، احمد، 2020: 91).
3. خێزان، هەموو مرۆڤێك کە خێزان پێمان دەبەخشێت لەهەر بارو دۆخێکی ئاکاریی کە هەر بەهایەکی هەبێت ئەوا کاریگەریی تەواوی لەسەر دروستبونی کەسێتی مرۆڤە، لەبەرئەوەی ئاڕاستەکردنی مرۆڤ بۆ هەربەهایەک لەچوارچێوەی خێزاندا دەبێت، لەسەر ئەمانە خێزان ڕۆڵێکی کاریگەرو بەهێزی لەسەر بنیات نانی کەسێتیمان هەیە(شحاتة، 2017، 14). هەروەها خێزان بە یەکەم ژینگەی منداڵ دادەنرێت کە تێیدا بەهاکان وەردەگرێت و بە دەستی دەهێنێت، لێرەوە دەتوانێت هاوسەنگی و گونجان لە ژیانی کۆمەڵایەتییدا بەدەست بهێنێت، لەکاتی پرۆسەی بەکۆمەڵایەتی بوندا لەناو خێزاندا هەندێك بەها بەدەست دێت، پاشان مرۆڤەکانی تر یان گروپەکان لەماوەی ژیانی کۆمەڵایەتیدا بەشداری تێدا دەکەن (ئیسماعیل، بابان، 2022: 22).
4. دەزگا پەروەردەییەکان، بە یەکێك لە گرنگترین سەرچاوەکانی بەها دادەنرێن بۆ چاودێریکردنی بەهاکان، لەڕێگەی پرۆگرامەکانەوە منداڵی تێدا ئاڕاستە دەکرێت، لە باخچە یان قوتابخانە بۆئەوەی ڕۆڵی خۆی بگێرێت، پێویستە ئەزمونی جۆراوجۆر پێشکەشبکات بۆ پەرەپێدانی بەهاکان بۆ منداڵ، دەرفەتیان بۆ برەخسێنێت بۆ ئەوەی لە بارەیانەوە فێربن و ئاگاداریان بن، باخچە یان قوتابخانە تەنها پەیوەندی بە بەهاکان و وەرگرتنیانەوە نیە لەڕوی تیۆرییەوە، بەڵکو چۆنیەتی بنیاتنانەوە و بەهێزکردنی ئەم بەهایانەیە لەڕۆحیاندا (حورية، 2016، 64). هەروەها زانکۆ وەك ناوەندێکی پەروەردەیی و ئەکادیمی نوێنەرایەتی ئەو چینە خوێندەوارە دەکات کە بۆ بەردەوامبونی شارستانیەت و کلتوری و خێزانیی گەشەکردن و بەردەوام بونی گەشەسەندنی کۆمەڵگە پشتی پێدەبەسترێت (عوسمان، بابان، 2022 :25).
5. دەزگاکانی ڕاگەیاندن (میدیا) - لەوانە (تەلەڤزیۆن، ڕادیۆ، ڕۆژنامە، گۆڤار، کتێب، ئینتەرنێت، سینەما، شانۆ، سۆشیال میدیا) کە بینراوو بیستراویکی گرنگ پێکدەهێنن و کاریگەریی ڕاستەوخۆ لەسەر مرۆڤ دروست دەکەن، بە تایبەت ئەو بابەتانەی

لەڕێگەیانەوە دەگات بە بینەرو بیسەر، هەریەك لەم دەزگایانە یان میدیایانە پشتگیریی لە بەدەستهێنانی ڕاستەوخۆی بەهاکان دەکەن لای مرۆڤ بەرپرسیارن لە گۆڕانکاریی بەهاکان و ململانێی بەهاکان، هەروەها لە دەستکەوتنی بەها ئاکارییەکان و لادانە ئاکارییەکانی مرۆڤ لە یەککاتدا (حورية، 2016: 66).

6. ئاین بە یەکێك لە سەرچاوەکانی بەهای ئاکاری دادەنرێت، لەبەرئەوە باوەڕبون بە خودا بە بەرزترین بەهای مرۆڤ دادەنرێت لەڕوی ئاینەوەو پاشان فریشتەکانی، کتێبەکانی پێغەمبەرانی، ڕۆژی دوایی، چاکەو خراپە، پیاوی ئاینی لەم ڕووەوە بەو کەسە دەوترێت کە بونیادی دەرونی بەرەو بەرزترین بەهای ڕەزامەندی دەڕوات و ئەوەی پیاوی ئاینی جیادەکاتەوە هەوڵنەدانیەتی بۆژیان لەم جیهانەدا (بوعطيط، 2017: 40).

### 3-2-2 گرنگی بەهاکان

بە هاکان بۆ مرۆڤ چەندین گرنگییان هەیە، لەوانە:

1. بەهاکانی مرۆڤ کاریگەریی لەسەر درکپێکردنی هەڵوێستەکان و ئەو کێشانە دەبێت کە مرۆڤ ڕوبەڕوی دەبێتەوە.
2. بەهاکان کاریگەریی لەسەر بڕیارو ئەو چارەسەرانەوە دەبێت کە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان پێشنیاری دەکات، بە واتایەکی دیکە ئەو ئەگەر و چارەسەرە هەڵدەبژێرێت.
3. بەها ئاڕاستەی کارکردن دیاریدەکەن، بەهاکان ئەوە دیاریدەکەن کە رەفتاری کارکردن چ شتێك پەسەندکراوە و چ شتێك ناپەسەندە.
4. بەهاکان قبوڵکردن و ڕەتکردنەوەی ڕەفتارەکان دیاریدەکەن.
5. بەهاکان ڕۆڵیان لە دیاریکردنی ئاستی کاری پەسەندو ناپەسەند دەبێت.
6. بەهاکانی مرۆڤ بنەمایەکە بۆ بڕیاردانی ئەندامبون لە گروپێك یان هەر دەستەیەك .
7. زیادبونی پاڵنەری مرۆڤ بۆ کارکردن لە سوودو گرنگی بەهاکانەوە دێت، بەو پێیەی پێزانینی خودی مرۆڤ زیاد دەکات، ئەمەش بەرهەمهێنانیان و خۆشەویستییان بۆ کار زیاد دەکات.

8. بەهاکان کاردەن بۆ بـەهێزکردنی پەیوەندییـەکانی برایـەتی و خوشەویسـتی لـە نێـوان هەموو ئەندامانی کۆمەڵگە و وایان لێدەکات لە جیهانێکی پڕ لە خۆشەویستی ئاشـتیدا بژین و هەست و پێداویستییەکانی ئەوی دیکە لەبەرچاو بگرن.
9. بەهاکان هۆکارن بۆئەوەی مرۆڤ ژیانێکی تەندروست بژیی و کار لـەڕوی چاکسـازیی و دەرونیەوە دەکات (صادق، رەحمان، احمد، 2020 :86) و (ئیسماعیل، بابان، 202 :9)

**4-2-2 بەهای ئاکاریی**

ئـەو چەمکـە ئاکاریانـەن کـە کاریگـەریی لەسـەر ڕەفتـاری مـرۆڤ بەجێـدەهێڵن و ڕاسـت و دروست و پەسەند دیاریدەکەن (بۆکانی، 2020 :61)، یان بەو ڕێکخستنە دەرونیانـە دەوتـرێن مرۆڤ لە ئەنجامی بەرکـەوتن یـان ژیـان لەگـەڵ دابونـەریتی کۆمەڵگـەدا بەدەسـتی دەهێنێـت، هەروەها لەناو ئەو کۆمەڵگەیەشدا جێبەجێی دەکات (القصیر، 2012 :344).

بەهای ئاکـاریی ڕێکخـراوە، هـەوەها گونجاندنێکـە کـە ئاینـە ئاسـمانیەکـان وەك پێـوەرێکی ڕەفتاریی مرۆڤ لە چوارچێوەی (خێـر و شـەڕ)دا دیارییـانکرد (الخوالـدة، 2003 :108)، ئاکـار بریتیە لە سیفەتی مـرۆڤ و پەیوەسـتە بـە بـەهاوە، مـرۆڤ لـە ئـەنجامی کـارلێککردنی لەگـەڵ خودی خۆی دروستی دەکات (لقصیر، 2012 :348).

بەهای ئاکاریی ڕێکخستنەوەی دەرونی مرۆڤە لەڕیگەی ژیانکردنیـەوە بەدەسـتی دەهێنێـت لە سەرچاوەکانی وەکو دابونەریت و کلتور لە کۆمەڵگەدا، هەڵدەستێت بە جێبەجێکردنی لەڕوی کرداییەوە، ئەم بەهایـەش کاتێـك بەدەردەکـەوێت کـە مـرۆڤ مامەڵـە لەگـەڵ خـودی خـۆیی و کۆمەڵگەدا دەکات (رفعت، د.ت :384).

بونیاتنانی بەهای ئاکاریی لای منداڵان هەر لەسەرەتای تەمەنیەوە دەست پێدەکات، ژینگەی خێـزان یەکـەم هۆکـارە بـۆ گەشـەکردنی بـەهای ئاکـاریی لای منـداڵان، پاشـان دامـەزراوە پەروەردەییەکانی وەکو (باخچەو قوتابخانە)، منداڵ لەسـەرەتادا توانـای تێگەیشـتنی بـۆ بـەها نیە، ناتوانێت ڕۆڵێك بگێڕێت کە کەسێکی گەورە پێی هەڵدەستێت لەبەرئەوەی پێویستە بەهای ئاکاریی لای منداڵان پەرەپێبدرێت و لای خۆشەویست بکرێت، بە تایبەت بەهای ئاکاریی، هـەر کاتێـك پێویسـتییەکانی منـداڵ لـەڕوی بایۆلۆجییـەوە تێربـو، پێویسـتی بـەوە هەیـە لـەڕوی

دەرونیشەوە ئەو پێویستیانەی تری دەست بکەوێت، بۆیە دەتوانین بڵێین بەهای ئاکاریی لای منداڵان توانای تێرکردن یان پڕکردنەوەی پێویستییەکانی هەیە (الملوح، د.ت :135).

پێوەر و ڕێنمایی ئاڕاستەکراو بۆ ئاکار لە ڕەوشتێکی جوان پێکهاتووە، بۆ ئەوەی ببێتە سیفەتێکی جێگیر و مرۆڤ مامەڵەیەکی دروستی پێبکات لەگەڵ کەسانی تردا، ئەوەیە کە مرۆڤ بەها ئاکارییەکان گرنگی پێبدات و گەشەی پێبدات (عبدالله، برقان، 2016 :148).

هەر لەبەرئەوە ئەو کۆمەڵە ڕەوشتە ئاکارییە ڕێکوپێك و جوانەیە کە پەیوەندییەکانی نێوان مرۆڤ و (خێزان) و ئەوانی تر هەندێك لەگەڵ هەندێکی تریان ڕێکدەخات، یان مرۆڤ لەگەڵ کۆمەڵگەکەی (Wenstop & Myrmel, 2006 :673)، یان لە ئاگابون لە مافی کەسانی تر لەڕوی ئاسایش و یەکسانی و دورکەوتنەوە لە تانە لێدان لە کەسی بەرامبەر ( Mohammed & Ringseis, 2001 :310)، بەهای ئاکاریی کۆمەڵێك بنەمایە کە مرۆڤ جێبەجێی دەکات بۆ ڕێزگرتن لە کەسانی تر و نواندنی ڕەفتارەکانی کە بگونجێت لەگەڵ بنەماو ڕێساو یاسا و دابونەریتی کۆمەڵگەدا بەشێوەیەکی گشتی کە سەرجەم مرۆڤەکانی کۆمەڵگە بڕوایان پێی بێت (منصور، عبداللطیف، 2018 :8).

**5-2-2 جۆرەکانی ڕەفتاری بەهای ئاکاریی**

بەهای ئاکاریی خۆی لە چەند ڕەفتارێکدا دەبینێتەوە وەك:

**1. ڕاستگۆیی:**

یەکێکە لەو ڕەفتارانەی بونی بەهای ئاکاری دەسەلمێنێت، کە پێویستە مرۆڤ بە کردەوە وتەکانی بیسەلنێنێت ڕاستی نەشارێکەوە و جێگای بڕوا بێت، نهێنی بپارێزێت، بە ئەمەك بێت و بەڵێنەکانی بەرێتەسەر، ئەو کارە بکات کە خەڵکی پێیان سپێردراوە (بۆکانی، 2020 :61).

هەروەها ڕاستگۆیی دەردەکەوێت لە تێپەڕاندنی گوفتار بە زمان بۆ کردەوە لە هەڵوێستەکاندا کە هیچ جیاوازییەکی نەبێت لە وتنی بە ئاشکرا و نهێنی. یان لە هەواڵدانی بابەتێك وەك ئەوەی کە هەیە. (القسم العلمي بمؤسسة الدرر السنية، د.ت :8 ).

ڕاستگۆیی لە نیەت لە قسەکردن لە کارەکان دڵسۆزی و متمانە پێکردن و سەرکەوتن و تەبایی دێنێتە کایەوە، گرنگە مرۆڤ لە نیەت و قسەکاندا ڕاستگۆ بێت و لە کارەکانید دڵسۆز بێت تا بە سەرکەوتوویی بەرەوو ئامانجەکانی هەنگاو بنێت و بێگومان دروستکەری گۆڕانکاری و بەرەووپێشچوون و پێشکەوتنیشە لە هەمان کاتدا دوردەکەوێتەوە لە خۆپەرستی و خۆویستی و دیدگای تەسك و زیان گەیاندن بە بەرژەوەندی ئەوانیترو کۆمەڵگە، (حسن، 2018).

جوانترین بەها دوای باوەڕهێنان بریتیە لە ڕاستگۆیی، چونکە ڕاستگۆیی بنەمای باوەڕە و پێچەوانەکەشی بنەمای دووڕوییە (ابن قیم، 1423هـ :268)، قۆناغی منداڵی ئەو قۆناغە گرنگە نموونەیەیە لە تەمەنی مرۆڤدا دەبێت بەهای ڕاستگۆیی تێدا بچەسپێنرێت، پێویستە دڵنیایی هەمیشەیی لەسەر ئەو جۆرە بەهایە هەبێت بۆ منداڵان، سەرەتا خێزان پاشان ناوەندەکانی فێربونی وەکو باخچەو قوتابخانە ڕۆڵێکی کاریگەریان هەیە لە گەشەپێدانی بەهای ڕاستگۆیی، لەبەرئەوەی پێویستە ڕاهێنانی بەردەوام بە منداڵان بکرێت لەسەر ئارامگرتن، هەروەها پێویستە کاتی تەواویشیان پێبدرێت بۆ بونیادنانی کەسێتییان لەسەر ڕاستگۆیی، ژیانیان لا خۆشەویست بکرێت هۆشیاربکرێنەوە لەسەر ئەو هەڵانەی کە دەیکەن ئاگاداربکرێنەوە لەوەی کە داهاتوویان بەندە بەو ڕەفتارەی کە ئەنجامی دەدەن، لەبەرئەوە پێویستە بەبێ دابڕان و بە دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵیان گرنگی بەهای ڕاستگۆییان بۆ شیبکرێتەوە و تێبگەیەنرێن، بە یەکێك لەو بابەتەگرنگانە دادەنرێت کە کاریگەریی لەسەر منداڵ دروست دەکات بۆ گەشەپێدانی بەهای ڕاستگۆیی، لە گێڕانەوەی چیرۆك (الشمري، 2019 :639).

**2. دادپەروەریی:**

دادپەروەریی هەستی منداڵە بەوەی مامەڵە لەگەڵ کەسانی تردا دەکات و هەمان مامەڵە و کرداری بەرامبەر ئەنجامبدرێتەوە، لەگەڵ هەمان ئەو توانایەی کە منداڵانی تر و نزیکەکانی ئەنجامی دەدەن لەناو خێزان یان باخچەی منداڵان یان قوتابخانە (عطیة، 2014 :292).

پێویستە منداڵ دادپەروەربێت لە بڕیار و قسەکانیدا، دژ بەو ستەمەی حەزی پێناکات بڕیاری ستەمکارانە دەرنەکات، بەرلەوەی بڕیاری دادپەروەرانە بدات مێشك کراوەبێت و هەموو لایەنەکانی بابەتەکە وەربگرێت، بۆ ڕەخساندنی هەلی یەکسان (بۆکانی، 2020 :61).

دادپەروەریی بەشێوەیەکی گشتی گرنگە بۆ هەموو گیانلەبەرانی سەر زەوی، لەپێناو ڕازیبون هەستکردن بە خۆشی و خۆشەویستی کار، دادپەروەریی تەنیا لەسەر چەند کەسانێکی دیاریکراو نیە یان دامەزراوەیەکی تایبەت یان تایبەتبێت بە کاتێکی دیاریکراوەوە، لەبەرئەوەی دادپەروەریی یەکێکە لە ئامانج و مەبەستەکان، بۆ هێنانەدی پێویستە چەندین ڕێگا بگیرێتەر (عطية، 2014 :293).

دادپەروەریی یەکێکە لە بنەما گرنگەکانی بەها، چ لەڕوی ئاینەوە چ لەڕوی مرۆییەوە، هەڵدەستێت بە جێبەجێکردنی ئەرکی خۆشگوزەرانی بۆ مرۆڤ و کۆمەڵ، لە هەر بوارێکدا جێبەجێ بکرێت وەك بواری (کارگێڕی، پەروەردەیی، سیاسی...هتد) واتاو گرنگی لەو کارەدا بەرجەستە دەبێت، هەر کۆمەڵگەیەك ئەرکی دادپەروەریی تێدا جێبەجێکرا مرۆڤ هەست بە دڵنیایی و دەستەبەرکردنی مافەکانی دەکات (عطية، 2014 :294).

### 3. ئەمانەت پارێزی

ئەمانەت پارێزی بریتیە لە پارێزگارییکردنی شتێك کە مافی خوداو بەندەی تێدابێت (الرومي، 1433هـ :92)، ئەمانەت پارێزی لای منداڵان کاریگەریی لەسەر گەشەکردن و بونیادنانی کەسێتی دروست دەکات، چونکە ئەمانەت پارێزی سیفەتێکی جوانی مرۆڤە، پێویستە لە قۆناغەکانی گەشەی منداڵدا گرنگی پێبدرێت، بەهای ئەمانەت هۆکارە بۆ برەودان و گەشەکردنی بەهای ئاکاریی لای منداڵ و دەبێتە هۆی ڕازاندنەوەی پەروەردەی منداڵ و گۆڕانکاریی لە سەرجەم کایەکانی ژیانیدا، ئەمانەت پارێزی پەیوەندی نێوان بەندەو خودا هەروەها پەیوەندی نێوان منداڵ و خێزان، مرۆڤ و کۆمەڵگە ڕێکدەخات (كردي، 2010).

ئەمانەتپارێزی پێویستییەکە لەسەر منداڵ و گەوەرە کە پێی هەستن، ئەویش پاراستنی ئەو بابەتانەیە کە لە ئەستۆیەتی، بەڵام نابێت ئەوەشمان لە بیر بچێت، کاتێك چەمکی ئەمانەت بۆ منداڵ شیدەکرێتەوە، پێویستە بەشێوەیەکی گشتگیر ئەو چەمکە بە منداڵان بناسرێنرێت،

تەنیا لە چوارچێوەی پاراستنی کەلوپەل یان پارەدا کۆنەکرێتەوە، چونکە ئەمانە بەشێکی بچووکن لە ئەمانەتپارێزی، لەبەرئەوە پێویستە ئەمانەت بەو مافانە دابنرێت کە پێویستە لەسەر مرۆڤ یان منداڵ مافی تەواوی بدەن بۆ خودی خۆیان و کۆمەڵگەکەیان، بۆ نموونە: جەستە ئەمانەتە، کات ئەمانەت، دایك و باوك ژینگەی دەوروبەری .....هتد، ئەمانە هەمووی ئەمانەتن، پێویستە منداڵ بەو شێوەیە فێر بکرێت کە بیانپارێزێت و مافی هەمووشیان بدات (عمر، 2019).

**4. ئارامگرتن**

ئارامگرتن یان خۆڕاگری بریتیە لە کۆنترۆڵکردنی خودی مرۆڤ خۆی لە کارێك کە ئارەزوی دەکات یان پێی خۆشە بیکات، لە هەمانکاتیشدا پەیوەستبونی بە دورکەوتنەوە لێی (الرومي، 1433هـ :96).

بەدەستهێنانی بابەتەکان لە کاتی خۆیاندا، بە ئارامی و بەبێ پەلە توانای منداڵان بۆ ئارامگرتن و چاندنی ئەم ڕەفتارە لە کەسێتی منداڵدا زیاد دەکات و لە هەمانکاتیشدا کارێکی ئاسان نیە، ئارامی و خۆڕاگری لە کاتی قسەکردن و گوێگرتن لە ئەویتر، یان ئارامگرتن و خۆڕاگری لە کاتی چاوەڕوانی ئەنجامێک یان پاداشتێک، یان ئارامگرتن لە کاتی گەڕان بەدوای زانیاری یان گەیشتن بە ئامانجێک، یەکێکە لەو هەنگاوەی کە پێویستە منداڵی لێوەی فێری ئارامگرتن ببێت، دیاردەیەکی ڕون و بێ پرسیار هەیە کە بریتییە لە لاوازی توانای منداڵەکانمان بۆ ئارامگرتن، چونکە زۆرێکیان پەلە دەکەن و بێزارن لە بەرپرسیارێتی، پەیوەندی، یان چالاکییەکان کە پێویستیان بە ئارامگرتن هەیە (عمر، 2017)

ئارامگرتن لە تایبەتمەندییەکانی مرۆڤە، ئەم ئارامگرتنە هیچ چاوەڕوان ناکرێت لە گیانلەبەران، لەبەر ناتەواوییان، زاڵبونی ئارەزووەکان بەسەر گیانلەبەراندا بەبێ ئەوەی هیچ شتێك بەرامبەری بوەستێت، ئارامگرتن کۆکەرەوەی گشت کردارێکی چاکەیە، ئەمەش پێویستە بۆ مرۆڤ لە گشت کات و ساتێکدا، مرۆڤ ژینگەی دەوروبەری هەمیشە پڕە لە بەڵا و کارەسات، لەبەرئەوەی هەمیشە پێویستی بە ئارامگرتن هەیە (شارەزووری، 2012 :8-10).

ئارامگرتن و خـۆڕاگری پێویسـتە بـۆ منـداڵان، یەکێکـە لـە بـەها ئاکارییـەکانی منـداڵ، کـە شوێنەواری کـاری چاکـەو پلـەو پایـەی بـەرز و خۆشەویسـتی خـوداو تـەواوی ئیمـان و ڕێگـەی سـەرکەوتن و دەسـتکەوتنی پێداویسـتییە دەرونـی و جەسـتەییەکانی فەراهەمـدەهێنێت (الرومي، 1433 : 100).

**5. لێبوردەیی**

زۆرێك لە زانایانی بواری پەروەردە و فێرکردن کۆکن لەسەر ئەوەی ساڵانی قۆناغی منـداڵی ڕۆڵکی گەورەی لە شانازیی بە خۆبونی منداڵ هەیـە، ئـەویش بـە پڕکردنـەوە و بەدەستهێنان و فێربونی منداڵ بە بەهای لێبوردەیی خۆشەویستی بەرامبەر بە کەسـانی تـر، باشـترین سـێکتەر کە ڕۆڵی هەبێت و بەرپەرسیاربێت لە بونیادنانی ئەم بەهایەدا دامەزراوەی کۆمەڵایەتی خێـزان و ناوەندی پـەروەردەیی باخچەیـە، ئـەم دوو دەزگـا کۆمەڵایـەتی و پەروەردەییـە بەرپرسـن لـە چاودێریکردنی منداڵ (حماد، 2018 :48-49).

یەکێك لە پێویستی و پاڵپشتییەکانی گەشەی بەهای ئاکاریی لای منداڵ و بەهای ژیانکردنی بریتیە لە پەیوەندی خۆشەویستی و ئاڵوگۆڕی، لەبەرئـەوەی ژیـان پێویسـتی بـە بـەها هەیـە تـا بەهۆیـەوە کەسـێتی منـداڵ بەرزبکاتـەوە، بـەهای لێبـوردەیی ڕۆڵێکـی گرنـگ دەبینێـت لـەو پەیوەندییـەدا، داهـاتووی بیرکردنـەوەی منـداڵ گیشـتگیر دەکـات، دەتوانێـت ڕوبـەڕوی ئاستەنگەکانی ژیان ببێتەوە (حسونة، 2011 :107).

**6-2-2 گرنگی بەهای ئاکاریی بۆ منداڵ**

لەگەڵ ئەوەی خودی بەهاکان بۆ منداڵان گرنگن، بەهای ئاکاریش وەك یەکێك لە جۆرەکـانی بەها بۆ منداڵان لەناو کۆمەڵگەو دەزگا پەروەردەییـەکان گـرنگن، کـە دەکرێـت خـۆی لـەم چەنـد خاڵەدا بخەینەڕو:

1. منداڵ چێژ لـە هەسـت بـە گـەورەیی و گوزارشـتی قبـوڵکراو لـەناو کۆمەڵگـەدا دەکـات، هۆکارە بـۆ ئـەوەی منـداڵ بـەدوای خۆشـگوزەرانیدا بگـەڕێت بـۆ خـۆیی و بـۆ کەسـانی تریش.

2. یارمەتی منداڵ دەدات بۆ پێشبینیکردنی ڕەفتاری ئەوانی تر لە هەڵوێستە جیاوازەکاندا.
3. وا لە منداڵ دەکات هاوسەنگی لەنێوان ڕەفتارەکانیدا پەیدا بکات.
4. لەڕێگەیەوە منداڵ رەفتارەکانی بەدەستدەهێنێت و وادەکات منداڵ بەدرێژایی قۆناغەکانی ژیانی بەردەوام بێت.
5. لەگەڵ ئەوەشدا وا لە منداڵان دەکات کە زیاتر حەزی بۆ باخچەو قوتابخانە بچێت.
6. زیادکردنی توانای داهێنەرانە لای منداڵان.
7. زیادکردنی توانای کارامەیی و دەستکەوتنی بەهاکان لە باخچەو قوتابخانە.
8. بەهاکان لە دروستکردنی ژینگەیەکی پەروەردەیی بۆ منداڵان لە باخچەدا و تێگەیشتنی زیاتر منداڵ و کارلێکی باش لە نێوان مامۆستا و منداڵ یان قوتابی بە دەست دەهێنێت.
9. بەهاکان رۆڵێکی گرنگ دەگێڕن لە دیاریکردنی سروشت و فۆڕمی پەیوەندی لەنێوان مرۆڤەکانی کۆمەڵگەدا. (السعوي، 2019 :103) (ئیسماعیل، بابان، 2022 :32-33).

**7-2-2 هۆکارە کاریگەرییەکان لەسەر بەها ئاکارییەکان لای منداڵان**

چەند هۆکارێکی کاریگەر هەیە لە گەشەکردنی بەهای ئاکاری لای منداڵان:

**1. زیرەکی:**

وەکو چۆن پەیوەندیی هەیە لەنێوان گەشەی مەعریفی و ئاکاریی وەکو (بیاجیە) ئاماژەی بۆ دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا منداڵان لەڕوی ئاکارییەوە پێشکەوتوون و گەشەیانکردووە لە زیرەکانن هەروەکو (کولبریج) ئاماژەی پێکردووە، بەڵام مەرجیش نیە ئەو منداڵانەی لەڕوی زیرەکییەوە پێشکەوتوون منداڵانێکی بەئاکاربن، ئاستی کەمی زیرەکی لای منداڵان قورسە لەسەر ئەو منداڵانەی  کە لە چەمکە ئاکارییە سروشتییەکان تێبگەن و لەهەڵوێستەکاندا درکی پێبکەن و جێبەجێی بکەن.

**2. دژی لە ڕەفتاری سروشتی:**

منداڵ دووچاری پەشێوی دەبێتەوە کاتێك دەبینێت دژییەك هەیە لەنێوان ئەوەی کە دایك و باوك یان مامۆستایان داوای دەکەن لە نێوان ڕەفتاری گەورەکان.

**3. ململانێ لەگەڵ فشارە کۆمەڵایەتییەکان:**

ئەو چەمکە ئاکاریانەی کە لەلایەن ئەو گروپەوە پەسەند دەکرێن، کە منداڵەکە سەر بەو گروپە بێت کە ڕەنگە لە گروپێکی تردا بە نەشیاو هەژمار بکرێت، کاتێک منداڵ لە ماڵەوە فێر دەبێت شەڕ لەگەڵ هیچ کەسێک نەکات، ئەوا لای گروپی هاوتەمەنەکانی بە کەسێکی ترسنۆك دادەنرێت، ئەمەش توشی کێشەی دەکات.

**4. تەمەن:**

فاکتەری تەمەن یەکێکە لەو هۆکارانەی کاریگەری لەسەر گەشەکردنی بەها ئاکارییەکان هەیە، وەک چۆن لەگەڵ بەرزبونەوەی تەمەن ئەزموون و گەشەی دەرونی تاک زیاد دەکات، هەروەها توانای جیاکردنەوەی زیاتری هەیە کە چی دروستە و چی هەڵە.

**5. ڕەگەز:**

زۆرێک لە لێکۆڵینەوەکان ئاماژەیان بەوە کردووە پێگەیشتنی ئاکار لە مێینە و نێردا کاریگەریی لەسەر ئەو ڕۆڵانە دەبێت کە لە ژیانیاندا دەیگێڕن، چونکە ڕۆڵی تایبەتی مرۆڤ بە پەیوەست بە هۆکارە کلتورییەکانەوە دیاری دەکرێت وەک پێوەرەکانی کۆمەڵایەتی و کەسی، کە لە بەرامبەردا کاریگەرییان لەسەر ئاکار هەیە چ نێر بێت یان مێ، و مانای ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە پێوەرەکانی کۆمەڵایەتیکردن لە کولتوورێکدا ڕۆڵی کچ و کوڕ دیاری دەکەن، ئەمەش کاریگەریی لەسەر پەروەردەی ئاکاری هەریەکەیان دەبێت.

**6. ژینگە :**

خێزان کاریگەریی لەسەر گەشەکردنی بەها ئاکاریەکانی منداڵ هەیە وەک: پاداشت و سزادان، چاودێریکردن، چیرۆکەکان. ..هتد. ژینگەی قوتابخانە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ کاریگەریی لەسەر بەها ئاکارییەکانی منداڵ هەیە، خێزان و قوتابخانە و میدیا و هاوڕێیان، دامەزراوەگەلێکن کە بەشدارییەکی بەرچاو دەکەن لە گەشەکردنی ئاکاری منداڵاندا. (عناني، 2009 :72)، (زبون و ئەحمەد، 2013 :1196).

### 8-2-2 تایبەتمەندییەکانی بەها ئاکارییەکان

بەها ئاکارییەکان چەندین تایبەتمەندی لەخۆ دەگرێت:

1. کۆمەڵایەتین: بەها کۆمەڵایەتیەکان گرێدراون بە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی، دەرئەنجامی ئەو کۆمەڵگایە و دواتر دەگەڕێنەوە بۆ کۆنترۆڵکردنی ڕەفتاری ئەندامەکانی، لە بنەڕەتدا دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە کە هێزی بەستنەوەی هەیە، بە شێوەیەک کە گەرەنتی پاراستنی یەکبون دەکات لەناو کۆمەڵگا.
2. بەهاکان خودین: بەهاکان پەیوەستن بە سروشتی دەرونی مرۆڤ خۆیەوە، ئەوەی لە ئارەزوو و مەیلی و پێداویستییەکان داوای دەکات، ئەوە مرۆڤە کە بەهای خۆی بە بابەتەکان دەبەخشێت، پەیوەستە بە ژیانی مرۆڤەوە، لەبەرئەوەی ڕۆڵی ڕێبەر و ڕاهێنەرێک دەبینێت کە ڕەفتاری خۆبەخشانەی مرۆڤ کۆنترۆڵ دەکات، پاشان سیماکانی کەسێتی خۆی و پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەوانی تر ڕێکدەخات.
3. پەیوەستە بە ژیانی مرۆڤەوە: لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاوازە، هەروەک چۆن لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەکی تر جیاوازە و لە کۆمەڵگایەکدا لە کولتوورێکەوە بۆ کولتوورێکی دیکە جیاوازە.
4. بەدەستهێنراوە: کە مرۆڤ دەتوانێت لە کاتی پرۆسەکانی کۆمەڵایەتی بوندا فێری بێت لە ئەنجامی ئەو کارلێکە کۆمەڵایەتییەی ڕودەدات و تاک بەشداری تێدا دەکات.
5. فێربون: لایەنێکی مەعریفی و زانیاری لەخۆدەگرێت و دەتوانرێت پێشکەشی فێرخواز بکرێت، هەروەها لایەنێکی ڕەفتاری هەیە کە دەتوانرێت لە ڕێگەی ڕاهێنان و بەهێزکردنەوە پەرەی پێبدرێت، کە تاک دەتوانێت لە ڕێگەی ئەزموونەکانی ژیانەوە فێری بێت.
6. قابیلیەتی گواستنەوەی هەیە: میراتێکی مرۆییە کە دەتوانرێت لە نێوان نەوەکاندا هاوبەش بکرێت، بەم شێوەیە یارمەتیدەرە بۆ پاراستن و مانەوەی لە قۆناغەکانی گەشەسەندنی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا. (الهواري، 2021: 362)

### 9-2-2 ئەو تیۆریانەی کە شیکاریی بەهاکان دەکەن

1. **(تیۆری مەعریفی)**

أ. **(البرت اليس – Albert Ellis، 1913-2007)**

یەکێکە لەو تیۆرییە مەعریفیانەی پەیوەندی بە چارەسەرەوە هەیە، شێوازێکی تەواوە چارەسەرکردن و فێربون لەسەر بنەمای تیۆری مەعریفی و سۆزداری و ڕەفتاری زانین دامەزراوە، پشتگیری لە چارەسەری دەرونی مرۆڤ و پەروەردەیی دەکات، پێکهاتووە لە تیۆری کەسێتی کە سیستەمێکی فەلسەفییە و شێوازێکی چارەسەری دەڕونی، ئارەزووی لایەنی مەعریفی کەسێتی، واتە پەیڕەوکردنی ئەو ڕەوتە مەعریفیەی کە تیشک دەخاتە سەر ئەو بیرکردنەوانەی کە لە دایک و باوک و دەوروبەرەوە فێردەبێت، هەروەها بەرپرسە لە ناخۆشی یان بەختەوەری، ئەوەی ئەم تیۆرە جیا دەکاتەوە ئەوەیە کە هەوڵی کۆکردنەوەی بیرۆکەکانی قوتابخانەی مەعریفی داوە و ڕەهەندی سۆزداریشی زیاد کردووە، نووسەری تیۆرەکە بیرۆکەکانی بۆ دوو جۆر دابەشکردووە (شێوازێکی بیرکردنەوەی عەقڵانی، شێوازێکی بیرکردنەوەی ناعەقڵانی). (ابريعم، 2016 :259)

بەپێی تیۆرییەکەی (اليس) ڕەفتاری هەڵچوونی دەکردێن بە دووجۆری سەرەکییەوە:

1. هەڵچوونی ئەرێنی: (خۆشەویستی و ڕێزو لێبوردەیی و یارمەتیدان و .....هتد)، دەگرێتەوە، ئەمەش بەرهەمی بیرکردنەوەی عەقڵانیە، لەبەرئەوە مرۆڤ لەم جۆرە هەڵچوونەدا هەست بە بەرپرسیارێتی و بەختەوەریی و بیرکردنەوەی لۆژیکی دەکات، گرنگی بە خۆی دەدات و دەتوانێت بە ئاسانی لەگەڵ خۆی و دەوروبەریدا خۆی بگونجێنێت.
2. هەڵچوونی نەرێنی: (تووڕەیی و خەمۆکی و دڵەڕاوکێ و شەڕەنگێزیی ....هتد) دەگرێتەوە، کە بەرهەمی بیرکردنەوەی ناعەقڵانیە، ئەم جۆرە هەڵچوونە مرۆڤ دووچاری شڵەژانی دەرونی دەکاتەوە، جۆرێك لە بیرکردنەوە نالۆژیکی و ناواقیعی لای مرۆڤ دەکات و ڕێگر دەبێت لەبەردەم پرۆسەی خۆگونجاندن و دەستکەوتنی بەهاکان، سەرچاوەی سەرەکی ئەم پرۆسەیەش لای ئەلیس بریتیە لە بیرکردنەوە مرۆڤ،

بیرکردنەوە عەقڵانی و هەڵچوونی ئەرێنی بەرهەمدەهێنێت و مرۆڤێکی خاوەن بەهاو گونجاو دروست دەکات، بەڵام بیرکردنەوەی ناعەقڵانی و هەڵچوونی نەرێنی مرۆڤێکی کەم بەهاو نەگونجاو نادروست بەرهەم دەهێنێت. (جافر، 2015 :66)

ئەم تیۆرە زیاتر جەخت لەسەر ئەو لایەنە دەکاتەوە دەکرێت لە ڕێگەی فێربونەوە دایکان و باوکان ڕۆڵێ سەرەکی تێدا دەبینن، ئەم تیۆرە کار لەسەر کەڵەکەبون و کۆبونەوە و وەرگرتنی زانیاریی و شارەزایی دەکات ئەمەش ئەو واتایە دەگەیەنێت کە منداڵ لە ئەنجامی ئەو پەیوەندییەدا شتی نوێ لە ئاکارەکان فێردەبێت، کەواتە بەهای ئاکاریی دەتوانرێت وەکو دەستکەوت سەیر بکرێت کە لە ئەنجامی فێربونەوە بە دەست دێت.

**ب. (ویلیام جلاسر – William Glassar، 1925-2013)**

(جلاسر – Glassar) پێیوایە مرۆڤ خۆی ڕەفتارەکانی دیاریدەکات و بەڕێژەیەکی کەم دەتوانن زاڵبن بەسەریدا، لەبەرئەوەی ئەوەمان بۆ دەردەخات کە مرۆڤ توانای کۆنترۆڵکردنی خۆی هەیە، لە ڕاستیدا کۆنترۆڵکردنی ڕەفتاری مرۆڤ تەنها لە ژێر کۆنترۆڵی ئێمەدایە، مێشکمان ڕێگە بە کۆنترۆڵکردنی ڕەفتارەکان دەدات لە ناوەوە، ئەم تیۆرییە لە نموونەی مەعریفیەوە هاتووە و پێشنیاری ئەوە دەکات، کە هەرچەندە جیهانی دەرەوە کاریگەری لەسەر ئێمە هەیە، بەڵام تەنها ئێمە بەرپرسیارین لە کردارەکانمان، ژینگە تەنها زانیاریمان بۆ دابین دەکات و ئێمە لێکدەدەینەوە و بە شێوەیەکی دیاریکراو کارلێک لەگەڵیدا دەکەین بەپێی هەڵبژاردنەکانمان، بەم شێوەیە ئەم تیۆرە گریمانەی دەکات کە ئێمە توانای کۆنترۆڵکردنی بیرکردنەوە و کردارەکانمان هەیە، تەنانەت کاریگەریی لەسەر هەست و فیزیۆلۆژیامان هەیە (علاءالدین، 2013 :150).

جلاسەر پێیوایە کە دەکرێت ڕەفتار بگۆڕدرێت، مرۆڤ دەبێت بتوانێت بارودۆخە واقیعییەکان لێکبداتەوە، بەرپرسیارێتی ڕەفتارەکانی و تەنانەت هەستەکانیشی لە ئەستۆ بگرێت (وەک چۆن لە ناوخۆدا دروست دەبن و دەتوانرێت دەستکاری بکرێن) و بە پێداویستییە کۆمەڵایەتییەکانی خۆی بەرێوەبچێت (پەیڕەوکردنی ئەخلاق ئامرازێکە بۆ پێدانی بەهای خود)

. ئەگەرنا لەوانەیە کێشەی وەک تێکچوونی دەرونی یان کێشەی گونجاندن لەگەڵ ژینگەدا سەرهەڵبدات (الخواجا، 2002 :319).

سەبارەت بە سوودی ئەم تیۆرە لە بەدەستهێنانی بەهای ئاکاریی لەڕێی پڕکردنەوەی پێداویستییە دەرونیەکانی مرۆڤەوە، ئەویش بە بەکارهێنانی بەرپرسیارێتی لای مرۆڤ، تا بەهۆیەوە هەست بە ژینگەو پەیوەندییە مرۆییەکان لە دەستکەوتنی بەهای ئاکاریی لە نێوان مرۆڤدا بکات، ئەویش بە گۆڕینی ڕەفتاری مرۆڤ لە باڕودۆخە واقیعییەکاندا، تا بەهۆیەوە مرۆڤ والێبکات لەگەڵ باڕودۆخەکاندا خۆی بگونجێنێت.

**ج. (ئارون بێك – Aron Beck – 1921 - 2021)**

کورتەی تیۆریەکە جەختکردنەوەیە لەسەر کۆمەڵك چەمك بەجۆرێك کاریگەریی لەسەر ڕەفتارەکان و هەڵچوونەکانی مرۆڤ هەیە وەك دەربڕینی خۆیی و پێشبینی خویی و تێڕانین و متمانە بەخۆی ....هتد)، ئەم چەمکانە هەڵچوونی مرۆڤ دباریدەکەن لەسەر چۆنیەتی مامەڵەکردن و گونجاندنی مرۆڤ لەگەڵ کەسانی تر، کە هۆکارە بۆ بەدەستهێنان و گەشەکردنی بەهاکانی مرۆڤ، لەبەرئەوەی کەسی تەندست ئەو کەسەیە کە چەمکەکانی دەربڕین لە ژایانیدا بەرجەستە بکات، بۆ ئەوەی بتوانێت خۆی بگونجێنێت و ڕەفتارێکی ئەرێنی بە دەست بهێنێت(جافر، 2015 :66)

شارەزاییەکانی منداڵ لەسەرەتای قۆناغەکانی تەمەنی هۆکارە بۆ دروستبونی بیروباوەڕە بنەڕەتییەکان سەبارەت بە ژینگەی دەوروبەری، منداڵ سەرەتا ئاگادارە بەوەی کە لەلایەن دایك و باوکییەوە خۆشەویستە، ئەمە دەبێتە هۆکارێك بۆ گەشەکردنی بیروباوەڕەکانی سەبارەت بەو خۆشەویستیی خۆی لە چوارچێوەی خۆشەویستاندا دەبینێتەوە و دەڵێت من کەسێکی خۆشەویستم یان کەسێکی بەتوانام، لێرەوە منداڵ هەڵدەسێت بە ڕۆڵی ئەرێنی خودی و لە قوناغی گەورەبوندا ڕەنگدانەوەی دەبێت، بە پێچەوانەیەوە کەسانی بێزراو ناگەنە ئاستی خۆشویستن، لەبەرئەوەی منداڵی جۆری یەکەم (خۆشەویستە) ئەوەی کە لە ژینگەی دەوروبەریدا ڕودەدات وەك بەهایەك دەبینێت و دەبیتە سەرچاوەیەکی سەرەکی لە دروستبونی بەها و دروستبونی یاسایەکی بنەڕەتی بۆ مرۆڤ (علاءالدین، 2013 :26-27).

سوودی ئەم تیۆرە لە بەهای ئاکاریدا دەمانگەیەنێتە ئەو ڕاستەییەی مرۆڤەکان بەپێی ئەو پەیوەندییەی هەیانە بونەوەرێکی چالاکن و لەگەڵ ڕوداوەکاندا دەگۆڕێن، ئەم گۆڕانەش بابەتییەو کاریگەریی لەسەر ڕەفتارەکانی مرۆڤ دروست دەکات.

**2. تیۆری مرۆیی و وجودی**

**أ. (کارل روجرز - Karl Rogers ، 1902 - 1987)**

چەمکێکی بنەڕەتی لە تیۆری (ڕوجرز - Rogers)دا بەدیدەکرێت کە بریتییە لە خود، چەمکی خود نوێنەرایەتی شێوازێك لە تێگەیشتنەکان دەکات کە تایبەتمەندییەکەی بریتیە لە ڕێکخستن و یەکگرتن، هەرچەندە خود دەگۆڕێت، بەڵام بە ڕێکوپێکی و یەکگرتوو دەمێنێتەوە، خود شتێکی بچووك نیە لەناو مرۆڤدا، بەڵکو خود کۆمەڵەیەکی هەماهەنگە لە تێگەیشتنەکان کە لە هۆشیاریی مرۆڤدا ئامادەیی هەیە، ڕۆجەرز پێی وایە هێزی بزوێنەری سەرەکی لە مرۆڤدا بەدەستهێنانی خودە، هەرچەندە پاڵنەری بەدەستهێنانی خود زگماکییە، بەڵام ئەو فێربون و ئەزموونانەی کە تاک بەرکەوتەی دەبێت کاریگەرییان لەسەر ئەم پاڵنەرە هەیە، بۆنموونە پەیوەندی منداڵ لەگەڵ دایکیدا پەیوەندییەکی گرنگە، چونکە کاریگەریی لەسەر هەستی خود دەبێت، کاتێکیش دایک منداڵ تێر دەکات، پێویستی بونی منداڵەکە بۆ خۆشەویستی زیاد دەبێت، کە ڕۆجەرز بە سەرنجی ئەرێنی ناوی دەبات، ئەمەش وادەکات منداڵەکە بە کەسێتی ئاساییەوە گەورە ببێت(ربیع، 2013: 372).

بە واتایەکی تر مەیلەکانی تاک بۆ خۆبەدیهێنان بە هەماهەنگی کاردەکەن بۆ تێرکردنی توانا زگماکیەکانی، بەو پێیەی ئەمە پێویستی بە پشتیوانی ئەرێنی هەیە لەلایەن پەروەردەکارانەوە و گرنگیدان بە منداڵەکە لە قۆناغە جیاوازەکانی گەشەکردنیدا، بە دابینکردنی ڕێگاکانی ڕێنماییکردنی لە کەسانی دیکە (دایک و باوک و پەروەردەکاران) کە دەتوانن ئەم پێداویستییە بەپەلەیانە تێر بکەن، ناسکی و خۆشەویستی دایک و باوک تەنها لە حاڵەتێکدا دەبێت، منداڵەکە لە چوارچێوەی هەندێک مەرجدا ڕەفتار بکات و ئەمەش وای لێدەکات پێداچوونەوە بە هەستە ڕاستەقینەکانیدا بکات بۆ ئەوەی بەو شێوەیە بێت کە ئەوانی تر دەیانەوێت، لەبەرئەوەی هەستی درۆی هەیە کە جێگەی هەستە ڕەسەنەکانی دەگرێتەوە، کاتێک منداڵەکە ناچار دەکرێت پێداچوونەوەی زیاتر بە بەهاکانی کەسانی دیکە بکات، ململانێ

و خۆفریودان زیاد دەکات و تاکە کەسەکە دەبێتە تونـدوتیژ و دڵەڕاوکـێ و هەڕەشـەئامێز، هەر لەبەر ئەم هۆکـارەش ڕۆجەرز لە شـێوازی چارەسـەری دەروونـی خۆیـدا پێشـنیاری یارمەتیـدان دەکـات کەسـەکە ئەزموونەکـانی خـۆی ڕێکـدەخاتەوە دوای پشـکنین و سـڕینەوەی ئەوەی کە لەگەڵ چەمکی خوددا ناتەبایە لە کەشێکی سەلامەتدا کە ئەم پێداچوونەوەیە بە چەمکی خـود و هەرسکردنی ئەزموونە ناکۆکەکان لەگەڵیدا ئاسان دەکات (علاءالدين، 2013).

سوودی ئەم تیۆرە سەبارەت بە بەهای ئاکاریی ئەو دەخاتەڕو کـە پەیوەندییـەکانی نێـوانی دایکـان و باوکـان و پـەروەردەکاران ڕێکدەخـەن سـەبارەت بـە ڕەفتارەکـانی منـداڵ و شـێوازی چارەسەرکردنی ئەو گرفتانەی کە لە ڕەفتارەکانی منداڵـدا دێتـە پـێش، تـا بەهۆیـەوە بـەهاکانی کەسانی دیکە لەبەرچاو بگیرێت و بگوازرێتەوە بۆ منداڵ.

**ب. (فیکتور فرانکل – Victor Frankl- 1905 - 1997)**

هەموو مرۆڤێك لە ژیانیدا پێویستی بە ئامـانجی تایبـەت و بـەدیهێنانی خـودی و ڕیزگـرتن هەیە، ئەگەر مرۆڤ نەیتوانی بەدەستی بهێنێت دەستەبەریان بکـات ئـەوا توانـای گەشـەکردنی بەهاکان و خوگونجاندنی نابێت لەگەڵ ژینگەی دەوروبەری، لەبەرئەوە فرانکل پێیوایە زۆربـەی شـڵەژانەکانی مـرۆڤ شـڵەژانی مانـان و هۆکارەکەشـی دەگەڕێتـەوە بـۆ بۆشـایی بـون (الفـراغ الوجودي)، هەروەها لەو بڕوایەدایە ژیانی مـرۆڤ ڕوبـەڕوی هـەردوو چـەمکی (بـون و نـەبون) دەبێتـەوە، یەکـەمیان جـەخت دەکاتـەوە لەسـەر کارلێـك و پەیوەنـدی مـرۆڤ لەگـەڵ جیهـانی دەرەوەدا و هەوڵـدانی بـەردەوامی مرۆڤـە بـۆ ژیـان و هەسـت بـە خـودکردن، بـەڵام دووەمیـان دەرەنجـانی ئامادەنـەبـونی هۆشـیاری خـودە و دواجـار سـەرهەڵدانی نەخۆشـی دڵـەڕاوکێ و خەمۆکی. (جافر، 2015 :68)

تیۆریەکەی فرانکل گرنگی لە واتای بون دەدات لە ژیانی مرۆڤدا، مرۆڤ دوچاری پەشـێویە دەرونیـەکـان دەبێتـەوە بـەهۆی لەدەسـتدانی واتـا لـەو بـوارەی کـە تێیدایـە، جـا هـەر بوارێکـە (خۆشەویستی، ئـازار، مامەڵەکردن...هتـد) فرانکـل پێیـوایە قۆنـاغی گەنجـان، کە نـوێنەرایەتی زۆرینەی گروپە دانیشـتووانەکان دەکەن لە کۆمەڵگاکانـدا، بە قۆنـاغێکی زۆر گرنـگ دادەنرێـت، چونکە بەرجەستەی ئەو واقیعەیە کە لە کۆمەڵگادا دەژیـن، هەروەهـا پێویسـتە تیشـک بخـرێتە

سەر مانا و مەبەستەكان لە هەموو ئەو شتانەی كە گەنجان (نێر و مێ)ی ئەم گرۆپە ڕوبەڕوی دەبنەوە، لەبەرئەوە فرانك گەیشتە ئەوەی كە ململانێ لەنێوان بەها جیاوازەكان و پەیوەندی بە واتای ژیانەوە هەیە، لەبەرئەوەی هەركاتێك مرۆڤ توانای دۆزینەوەی واتای بابەتەكانی هەبێت ئەوا بۆشاییەكی زۆری لە بونیدا دۆزیوەتەوە، ئەمەش دەبێتە هۆی گەشەكردن و هەستكردنی بە بەها ئەویش لەڕێگەی (خۆشی) وەرگرتن بەو هەستەی كە هەیەتی (علاءالدين، 2013 :339-338).

بەرجەستەبونی واقیع لەم تیۆرەدا بە یەكێك لە سوودەكانی ئەم تیۆرە دادەنرێت سەبارەت بە ڕەفتارە ڕەستەقینەكانی مرۆڤ لەگەڵ ژینگەی دەوروبەری، بەپێی ئەم تیۆرە ململانێ لە دەستكەوتنی بەهاكان پەیوەندی بە ململانێی واقعی ژیانەوە هەیە، بە تایبەت ئەو واقعەی كە مرۆڤ مامەڵەی تێدا دەكات لەگەڵ یەكتردا.

## 3-2 توێژینەوەكانی پێشوو

### 1-3-2 توێژینەوەكانی تایبەت بە (چیرۆك)

**1. توێژینەوەی (ابورخية، 2013)**

بە ناونیشانی ( كاریگەریی چیرۆكی منداڵان لە گەشەپێدانی هەندێك لێهاتویی گوزارشتی زارەكی داهێنەرانە لای منداڵانی پۆلی چوارەمی بنەڕەتی)، فەلەستین.

ئامانجی توێژینەوەكە بریتبو لە زانینی كاریگەریی چیرۆكی منداڵان لە گەشەپێدانی هەندێك لێهاتویی گوزارشتی زارەكی داهێنەرانە لای منداڵانی پۆلی چوارەمی بنەڕەتی، توێژەر میتۆدی (ئەزموونی) بەكارهێناوە، كە لەگەڵ توێژینەوەكەیدا گونجاوە لە دیاریكردنی كاریگەریی چیرۆك لە دەستكەوت.

توێژەر (64) قوتابی لە هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ دیاریكرد، دابەشیكردبون بەسەر دوو گروپدا، گروپی ئەزموونی كە لە (32) قوتابی پێكهاتبون و گروپی كۆنترۆڵكراو لە (32) قوتابی پێكهاتبون، توێژەر چیرۆكی منداڵانی دابەشكرد بەسەر گروپی ئەزموونیدا بۆ ماوەی دوومانگ، تا لەلایەن قوتابییەكانەوە لە ماڵەوە بیخوێننەوە، پاشان توێژەر كارتی تێبینی بەكارهێنا، بۆ

تاقیکردنەوەی زارەکی لە لێهاتووییەکانی گوزارشتی زارەکی داهێنەرانە کە لەلایەن تـوێژەرەوە ئامادەکرابو. لە کۆتایدا توێژەر گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە :

- ئاستی ئاماریی بەڵگەداریی نیـە لـەنێوان گروپـی ئـەزموونی و گروپـی کـۆنترۆڵکراو لـە بەکارهێنانی پێشەکی کارتی تێبینی بۆ لێهاتویی گوزارشتی زارەکی داهێنەرانە.
- بونی ئاستی ئاماریی بەڵگەداریی لەنێوان ناوەندە ژمێرەیی گروپی ئەزموونی و گروپی کۆنترۆڵکراو لە بەکارهێنانی پاشەکی کارتی تێبینی لە پێشکەشکردنی چیرۆکی منداڵان لە لێهاتوییەکانی گوزارشتی زارەکی داهێنەرانە کە لەبەرژەوەندی گروپی ئەزموونیە.
- بونی ئاستی ئاماریی بەڵگەداریی لەنێوان گروپی ئەزمـوونی و گروپـی کـۆنترۆڵکراو لـە تاقیکردنـەوەی خوێنـدنی پاشـەکی لـە دانـانی چیرۆکـی منـداڵان لـە لێهاتوییـەکانی گوزارشتی زارەکی داهێنەرانە لەبەرژەوەندی گروپی ئەزموونیە.
- ئاستی ئاماریی بەڵگەداریی نیە لە دەستکەوتی خوێندن بۆ زمانی عەرەبی لای منداڵانی پـۆلی چـوارەمی بنـەڕەتی و ئاسـتی گونجانـدنی لێهاتوویـەکانی گوزارشـتی زارەکـی داهێنەرانە.

### 2. توێژینەوەی (الرشدي، 2017)

بـە ناونیشـانی (کاریگـەریی چیرۆکـی منـداڵان (ئـاینی و کۆمەڵایـەتی) لـە گەشـەپێدانی لێهاتوویـەکانی بیرکردنـەوەی داهێنەرانـە لای منـداڵانی پـێش چوونـە قوتابخانـە لـە ناوچـەی (القصيم) – لە مەملەکەتی عەرەبی سعودی). سعودیە.

ئامانجی توێژینەوەکە بریتیبو زانینی (کاریگەریی چیرۆکی منداڵان (ئاینی و کۆمەڵایـەتی) لە گەشەپێدانی لێهاتووییەکانی بیرکردنەوەی داهێنەرانـە لای منـداڵانی قۆنـاغی پـێش چوونـە قوتابخانە لە ناوچەی (القصيم) – لە مەملەکەتی عەرەبی سعودی).

میتـۆدی توێژینەوەکـە بریتیـە لـە میتـۆدی (ئـەزموونی) بەشـێوەی بـەراوردکردنی ئاسـتی بیرکردنەوەی داهێنەرانە لای منداڵانی باخچە پێش و پاشی کۆنترۆڵکردن، توێژەر (92) منداڵی وەرگرتـووە، بەشـێوەی مەبەسـتدار لـە قوتابخانـەی (نـور العلـوم) لـە قۆنـاغی ئامادەکردنـدا و باخچەی (درة) لە قوتابخانە ئەهلیـدا، کـە تەمـەنیان لـەنێوان (4-5) سـاڵیدابو، تـوێژەر نمونـەی توێژنیەوەکـەی دابەشـکردبو بەسـەر سـێ گروپـدا، دوو گروپیـان بەشـێوەی ئـەزموونی و یـەك

گروپیان بەشێوەی کۆنترۆڵکراو، گروپی کۆنترۆڵکراوی یەکەم (31) منداڵ بون کە چیرۆکی ئاینی بەسەردا جێبەجیکردن، و گروپی کۆنترۆڵکراوی دووەم (31) منداڵ بون کە چیرۆکی کۆمەڵایەتی بەسەردا جێبەجێکردن، گروپی کۆنترۆڵکراو ژمارەیان (30) منداڵ بو.

توێژەر لە کۆتایدا گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە ئاستی ئاماریی بەڵگەداریی هەیە لەنێوان هەردوو گروپی ئەزموونی و گروپی کۆنترۆڵکراو لە لێهاتوییەکانی بیرکردنەوەی داهینەرانە کە لە بەرژەوەندی گروپی ئەزموونی بو.

### 3. توێژینەوەی (ماجدة و اخرون، 2018)

بەناونیشانی ( کاریگەریی چیرۆك لەسەر زمان پاراوی لای منداڵانی باخچە، توێژینەوەیەکی پراکتیکییە لە باخچەی منداڵانی – جیجیل)جەزائر.

ئامانجی توێژینەوەکە بریتیبو لە:

- زانینی رۆڵی باخچە لە گەشەپێدانی زمان پاراوی لای منداڵانی باخچە بەهۆی چیرۆکەوە.
- زانینی ئەو چالاکیانەی پێشکەشی منداڵانی باخچە کراوە لە نێوانیاندا چیرۆك کە گەشە بە زمان پاراوی دەدات.
- هەوڵدانی باخچەی منداڵان لە تێبینیکردنی گەشەپێدانی زمان پاراوی لای منداڵان.
- زانینی پرۆگرامی پێشکەشکراو لەناو باخچە لە نێوانیدا چیرۆك و ئاستی کاریگەریی.
- زانینی ڕۆڵی پەروەردەکار و شێوازی خوێندنەوەی چیرۆك و ئاستی کاریگەریی لەسەر منداڵ.
- گەیشتن بە تاقیکردنەوەی گریمانەی توێژینەوەکەی نزیککردنەوەی لە ڕاستی.

بۆ گەشیتن بەو ئامانجانەی سەرەوە توێژەر میتۆدی (وەسفی) بەکارهێنابو، چونکە ئەو میتۆدەی بە گونجاوزانیوە و لەگەڵ توێژینەوەکەیدا گونجاوە، بۆ دیاریکردنی نمووونەی توێژینەوەکەی توێژەر (40) پەروەردەکاریی وەرگرتووە بەپێی تایبەتمەندییەکانی (تەمەن، باڕودۆخی کۆمەڵایەتی، شارەزایی پیشەیی.

توێژەر لە کۆتایی توێژینەوەکەیدا گەیشتە ئەم دەرەنجامانەی لای خوارەوە:

- پەیوەندییەکی بەهێز هەیە لەنێوان چیرۆکی منداڵان و زمان پاراوی لای منداڵانی باخچە منداڵان.
- پەیوەندییەکی بەهێز هەیە لەنێوان ڕێگای گێڕانەوەی چیرۆکی منداڵان و حەزی گوێگرتن بۆی.
- پەیوەندییەکی بەهێز هەیە لەنێوان جۆرەکانی چیرۆکی پێشکەشکراو بۆ منداڵان و بەرزی ئاستی زمان پاراوی.

### 4. توێژینەوەی (Nurdini, 2018)

بە ناونیشانی (کاریگەریی چیرۆکە ئاکارییەکان لەسەر ڕەفتاری منداڵان)، ئەندۆنوسیا.

ئامانجی توێژینەوەکە بریتیبو (دیاریکردنی کاریگەریی چیرۆکە ئاکارییەکانە لەسەر ڕەفتاری منداڵان)، بۆ گەیشتن بەم ئامانجە توێژەر پشتی بە میتۆدی ئەزموونی بەستووە، (30) منداڵ وەك نموونەی توێژینەوەکە وەرگیراوە لە هەردوو پۆلی (B3 و B6)و دابەشکردوون بەسەر دوو گروپدا (ئەزوونی و کۆنترۆڵکراو)، ئامڕازی توێژینەوەکە بریتیبوو لە تاقیکردنەوەی کرداریی، هەروەها شیکاری داتا بەدەستهاتووەکانی لەڕێگەی ئامڕازی ئاماری (T-test)ەوە بووە، دەرەنجامی توێژینەوەکەش ئەوەی خستنەڕو کە چیرۆکە ڕەفتارییەکان کاریگەریی زۆریان هەیە لە گەشەپێدان و چاندنی ڕەفتاری منداڵان.

### 5. توێژینەوەی (المعموري، 2019)

بە ناونیشانی (چیرۆکی شەعبی و کاریگەریی لە گەشەکردنی خەیاڵ لای منداڵانی قۆناغی سەرەتایی لە دەربڕینی هونەرییدا). بابل

ئامانجی توێژینەوەکە (زانینی کاریگەریی چیرۆکی شەعبیە لە گەشەکردنی خەیاڵی منداڵان لە قۆناغی سەرەتایی لەڕێگەی دەربڕینی هونەرییەوە، بۆ گەیشتن بەم ئامانجە توێژەر میتۆدی ئەزموونی بە کارهێناوە، نموونەی توێژینەوەکە بریتیبو لە (78) منداڵی قوتابی لە هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ).

توێژەر لە کۆتایدا گەیشتە ئەنجامی ئەو گفتوگۆیەی لەنێوان کارەکتەری چیرۆکەکەدا ڕویداوە سوودی هەبوە لە گەشەپێدانی لێهاتویەکانی منداڵان، هەروەها پەیوەندی نێوانیان لەگەڵ خێزانەکانیان، لەگەڵ ئەوەشدا لێهاتویی لە خوێندنەوە زیادیکردووە، هەروەها چیرۆك چالاکی سۆزداریی لای منداڵان زیادکردووە بەهۆی فراوانبونی خەیاڵ و دەرخستنی شوێن و کات و ڕوداوەکانی چیرۆکەکە، بەهۆی فێربونی چەند زاراوەیەکی نوێوە.

**6. توێژینەوەی (المخمري، 2021)**

بـە ناونیشـانی ( کاریگـەریی گێڕانـەوەی چیرۆکـی ژمـارەیی لەسـەر پاڵنـەری فێربـون لای خوێندکارانی بازنەی دووەم لـە بابـەتی کۆمەڵایـەتی، توێژینەوەیـەکی مەیدانیـە لـە سـەڵتەنەی عەمان). ئوردن.

ئامانجی توێژینەوەکە بریتیە لە: زانینی کاریگەریی گێڕانەوەی چیرۆکی ژمارەیی لەسەر پاڵنەری فێربون لای خوێندکارانی بازنەی دووەم لە بابەتی کۆمەڵایەتی. توێژەر بۆ ئەوەی بە ئامانجی توێژینەوەکەی بگات میتۆدی (وەسفی و نمیچە ئەزموونی) بەکارهێناوە.

نموونەی توێژینەکەی بریتیە لە (63) خوێندکار، کە دابەشیکردووە بەسەر دوو گروپی (ئەزموونی کۆنترۆڵکراو)دا، گروپی ئەزموونی بریتبو لە (32) خوێندکار و گروپی کۆنترۆڵکراو (31) خوێندکار.

لە کۆتایی توێژینەوەکەیدا توێژەر گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە ئاستی ئاماریی مەعنەوی بەلگەداریی هەیە بە پێی ئاستی (0.05) لەنێوان هەردوو گروپی توێژنیەوەکە کە بەشێوازی گێڕانەوەی چیرۆکی ژمارەیی خراوەتەڕو بۆ پێوەری پاشەکی پاڵنەری فێربون کە لە بەرژەوەندی گروپی ئەزموونی بو.

**2-3-2 بەراوردی توێژینەوەکانی پێشوو بە توێژینەوەی بەردەست**

**1. ئامانجی توێژینەوەکان**

ئامـانجی توێژینـەوەی (ابورخیـة، 2013) بریتیـە لـە زانینـی کاریگـەریی چیرۆکـی منـداڵان لـە گەشەپێدانی هەندێك لێهاتویی گوزارشـتی زارەکـی داهێنەرانـە لای منـداڵانی پـۆلی چـوارەمی بنـەڕەتی، هـەروەها ئامـانجی توێژینـەوەی (الرشـدي، 2017) بریتیـە لـە زانینـی (کاریگـەریی

چیرۆکـی منـداڵان (ئـاینی و کۆمەڵایـەتی) لـە گەشـەپێدانی لێهاتووییـەکانی بیرکردنـەوەی داهێنەرانە لای منداڵانی قۆناغی پێش چوونە قوتابخانە لە ناوچەی (القصیم) – لە مەملەکـەتی عەرەبی سعودی). بەڵام ئامانجی توێژینەوەکەی (ماجدة و اخـرون، 2018) بریتیـە لـە زانینـی رۆڵی باخچە لە گەشەپێدانی زمان پاراوی لای منداڵانی باخچە بەهۆی چیرۆکـەوە، زانینـی ئـەو چالاکیانەی کە پێشکەشی منداڵانی باخچە کراوە لە نێوانیاندا چیرۆك کە گەشە بە زمان پاراوی دەدات، هەروەها هەوڵدان باخچـەی منـداڵان لـە تێبینیکردنـی گەشـەپێدانی زمـان پـاراوی لای منداڵان، زانینی پرۆگرامی پێشکەشکراو لەناو باخچە لە نێوانیدا چیرۆك و ئاسـتی کاریگـەریی، زانینی ڕۆڵی پەروەردەکار و شێوازی خوێندنەوەی چیرۆك و ئاستی کاریگـەریی لەسـەر منـداڵ، گەیشـتن بـە تاقیکردنـەوەی گریمانـەی توێژینەوەکـەی نزیککردنـەوەی لـە ڕاسـتی، هـەروەها ئامانجی توێژینەوەکەی (العوامرة، 2019) بریتیە لە (زانینی کاریگەریی چیرۆکی شـەعبیە لـە گەشەکردنی خەیاڵی منداڵان لە قۆناغی سەرەتایی لەڕێگـەی دەربڕینـی هونەرییـەوە، ئامـانجی توێژینەوەکـەی (المخمـري، 2019) ئامـانجی توێژینەوەکـە بریتیـە لـە: زانینـی کاریگـەریی گێڕانەوەی چیرۆکی ژمارەیی لەسەر پاڵنەری فێربون لای خوێندکارانی بازنەی دووەم لە بابەتی کۆمەڵایەتی.

لەگەڵ ئەوەی سەرجەم توێژینەوەکان کاریگـەریی چیـرۆك دەدەخـەن لەسـەر گۆڕاوەکـانی توێژینەوەکەیان، ئەمە دەبێتە خاڵی جیاوازی نێوان توێژینەوەکان، بەڵام ئامانجی توێژینـەوەی بەردەست بریتیە لە زانینی کاریگەریی چیرۆك لەسەر بەهای ئاکاریی لای منداڵانی باخچە. هیچ کام لە توێژینەوەکانی پێشوو ئاماژەیان نـەکردووە بـەوەی کـە چیـرۆك چ کاریگەرییـەك لەسـەر بەهای ئاکاریی دروست دەکات لای منداڵانی باخچە.

**2. میتۆدی توێژینەوەکان**

سەبارەت بە میتۆدی توێژینەوەکان لە هەندێکیان میتۆدی توێژینەوەکەیان وەکو یەك وایە، میتـۆدی توێژینـەوەکانی (ابورخیـة، 2013) (الرشـدي، 2017) (العـوامرة، 2019) میتـۆدی ئەزموونیان بەکارهێناوە کە لەگەڵ ناوەڕۆکی توێژینەوەکەیاندا گونجاوە، بەڵام توێژینەوەکـەی (ماجـدة و اخـرون، 2018) و (المخمـري، 2019) میتـۆدی وەسـفییان بـەکارهێناوە، تـەنها جیاوازییەکان ئەوەیە کە توێژینەوەکەی (المخمري، 2019) لەگەڵ ئەو جۆرە میتۆدەدا میتۆدی

نیمچە ئـەزموونی بـەکارهێناوە، کەواتـە میتـۆدی توێژینـەوەی بەردەسـت لەگـەڵ هـەر یـەك لـە میتــۆدی توێژینــەوەکانی (ابورخیــة، 2013) (الرشــدي، 2017) (العــوامرة، 2019) میتــۆدی ئەزموونیان بەکارهێناوە.

### 3. کۆمەڵگەو نموونەی توێژینەوەکان

بەو پێیەی توێژینەوەکان شوێن و کۆمەڵگەی توێژینەوەکـەیان جیـاوازە لـە یـەکتری بۆیـە ژمارەو نموونەی توێژینەوەکەش لـە یـەکتری جیـاوازن، کۆمەڵگەی توێژینەوەکـەی (ابورخیـة، 2013) و (المخمري، 2019) بریتیە لە قوتابیان بەڵام لەڕوی ژمارەی نموونەی توێژینەوەکـەوە لە یەکتری جیـاوازن نموونـەی توێژینەوەکـەی (ابورخیـة، 2013) (64) قوتـابی بـوە نموونـەی توێژینـەوەی (المخمـري، 2019) بریتیـە لـە (63) قوتـابی، کـە دەکرێـت بڵێـین لـە یەکترییـەوە نزیکن، بەڵام کۆمەڵگەو نموونەی توێژینەوەکـەی (ماجـدة و اخـرون، 2018) جیـاوازە، چونکـە (40) پەروەردەکاریی وەرگرتووە وەك نموونەی توێژینەوەکەی، هەرچی توێژینەوەی (الرشدي، 2017) و (العـوامرة، 2019) و توێژینـەوەی بەردەسـتە کۆمەڵگـەوە نموونـەی توێژینەوکـەیان منـداڵانی باخچەیـە، بـەڵام لـەڕوی ژمـارەی نموونـەی توێژینەوەکـەوە لەیـەکتـری جیـاوازن، توێژینەوەکــەی (الرشــدي، 2017) (92) منــداڵی باخچــەی وەك نموونــەی وەرگرتــووە و توێژینەوەکـەی (العـوامرة، 2019) (78) منـداڵی باخچـەی وەرگرتـووە، بـەڵام توێژینـەوەی بەردەست کەمتر لەو دوونموونەیـە منداڵی باخچـەی وەرگرتـووە کـە بریتیـە لـە (40) منـداڵی باخچە.

### 4. ئامڕازی توێژینەوەکان

ســەرجەم توێژینــەوەکان (الرشــدي، 2017) و (ماجــدة و اخــرون، 2018) و (العــوامرة، 2019) و (المخمري، 2019) و توێژینەوەی بەردەست ئـامڕازی توێژینەوەکـەیان بریتیبـوە لـە بەکارهێنانی چیرۆك بۆ پێوانەکردن و دیارکردنی کاریگەریی چیرۆك لەسەر منداڵان بەپێی ئـەو گۆڕاوەی کە لە توێژینەوەکانیاندا هاتووە، بەڵام توێژینەوەی (ابورخیـة، 2013) کـارتی تێبینـی بەکارهێنا، بۆ تاقیکردنـەوەی زارەکـانی لـە لێهاتوویـەکانی گوزارشـتی زارەکـی داهێنەرانـە کـە لەلایەن توێژەرەوە ئامادەکرابو.

# بەشی سێیەم

# لایەنە کردارییەکانی توێژینەوەکە

**3-1 میتۆدی توێژینەوەکە**

**3-2 کۆمەڵگەی توێژینەوەکە**

**3-3 نمونەی توێژینەوەکە**

**3-4 کۆنترۆڵکردنی گۆڕاوەکان**

**3-5 ئامرازەکانی توێژینەوە**

**3-6هەنگاوەکانی جێبەجێکردنی ئەزموونی توێژینەوەکە**

**3-6 هاوکێشە ئامارییەکان**

## بەشی سێیەم

## لایەنە کردارییەکانی توێژینەوە

ئەم بەشــە بەوردی بــاس لەو ڕێــگەو شــوێنانە دەکــات کە تــوێژەر گرتــویەتییە بەر بــۆ جێبەجێکردنی کارەکانی و دیزاینکردنی ئامرازو پێداویستییەکانی توێژینەوەکە.

### 1-3 میتۆدی توێژینەوەکە:

میتۆدی توێژینەوە بریتیە لە شێوازی بیرکردنـەوە و جێبـەجێکردن، کـە تـوێژەر پشـتی پـێ دەبەستێت بۆ دەستکەوتن و تـەواوکردنی توێژینـەوەکـەی لـە ڕێکخسـتنی بیروبۆچوونـەکان و شیکارکردنیان، هەروەها خستنەڕوی ڕاستیەکان و گرفتی بابـەتی توێژینەوەکـەی دیاریـدەکات، (دشلي، 2016 :53) .

میتـۆدی ئـەزموونی وردتـرین میتـۆدی توێژینەوەیـەو، تـوێژەر تـەنها دۆخەکـە وەسـف و دیاری ناکات، بەڵکو هەڵدەستێت بە چارەسەرکردنی فاکتەرەکانی توێژینەوەکەی بەشـێوەیەکی ورد و سیســتماتیك کۆنترۆڵیــان دەکــات، تــاوەکو لــە هۆکارەکــانی بەرقــەراربونی ڕوداوێــك بکۆڵێتەوە، لەبەرئەوەی لە توێژینـەوەی ئەزموونگەریـدا کـۆنترۆڵی فاکتـەرەکانی هەڵوێسـتەکە دەکرێـت و تـەنها یـەکێك لـە فاکتـەرەکان ڕەهـا دەکرێـت تـا بزانرێـت بـە چ ئاسـتێك ڕۆڵـی لەڕوداوەکانی هەڵوێستەکەدا هـەبـوە (بۆکـانی، 2020 :101)، لـەم ڕوانگەیـەوە تـوێژەر پشـت دەبەســـتێت بە بەکارهێنـــانی (میتـــۆدی ئەزمـــوونی) لەبەرئەوەی گونجـــاوە لەگەڵ ئەم توێژینەوەیەبۆ مامەڵەکردن لە گەڵ گۆڕاوەکان ،بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکان، ئەویش لە پێنـاو ناســاندنی کــاریگەری چیــرۆك لەگەشــە پێــدانی بەهــا ئاکارییەکــان لای منــداڵانی نمــونەی توێژینەوەکە لە (دووگروپ) پێکهاتووە (گروپی ئەزمـونی) و(گروپـی کـۆنترۆڵکراو)ە (گروپـی ئەزمـونی )چیرۆکیـان پێشکەشـکرا لەڕێـگەی بەکارهێنـانی چیرۆکـی پەروەردەیـی (گروپـی کۆنترۆڵکراو وانەی ئاساییان پێوترا ،تاقیکردنەوەی پێشەکی و پاشـەکی بـۆ هـەردوو گروپەکـە ئەنجامدرا.

### 2-3 کۆمەڵگەی توێژینەوەکە:

مەبەست لە کۆمەڵگەی توێژینەوە هەموو ئەو مرۆڤانە دەگرێتەوە کە ئەو دیاردەیە یان ئەو کێشەیەی تێدایە و توێژینەوەکەی لە سەر ئەنجامدەدرێت (داود، 2005 :57).

کۆمەڵگەی بنەڕەتی ئەم توێژینەوەیە سەرجەم منداڵانی ئاستی دووەمی قۆناغی باخچەی منداڵانە" کە تەمەنیان (5) ساڵە تۆمارکراون لە پارێزگای سلێمانی بۆ ساڵی خوێندنی (2022-2023)، بەڕێوەبەرێتی پەروەردەی ڕۆژهەڵات (14179) منداڵ و بەڕێوەبەرێتی پەروەردەی ڕۆژئاوا (3541) منداڵ، کە کۆی گشتی بریتیە لە (17720) منداڵ[1].

### 3-3 نمونەی توێژینەوەکە:

نمونەی ئەم توێژینەوەیە توێژەر سامپڵێکی بەمەبەست هەڵبژاردوە کە لەگەڵ ئامانجەکانی توێژینەوەکەی گونجاو بێت کە لە (40) منداڵ پێکهاتووە لە باخچەی منداڵانی (کازیوە)لە بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی ڕۆژ ئاوای سلێمانی و بەپێی کۆمەڵ دابەشکراون، کۆمەڵەی یەکەم (ئەزمونی) و کۆمەڵەی دووەم (کۆنترۆڵکراو) وەك لە خشتەی (1)دا خراوەتەڕو.

توێژەر ئەم باخچەیەی هەڵبژارد لەبەر ئەم هۆکارانەی خوارەوە:

1. باخچەی منداڵانی کازیوە لەڕوی شوێن ودورو نزیکییەوە بۆ توێژەر گونجاوبو، چونکە لەکاتی کارکردن و ئامادەبونیدا دەیتوانی بەبێ ئاستەنگ و لەکاتی خۆیدا ئامادەبێت.
2. گونجانی توێژەر لەگەڵ دەستەی کارگێڕی باخچەکەدا، چونکە دەستەی کارگێڕیی و مامۆستایانی باخچەکە ئامادەیی خۆیان دەربڕیبو لە هاوکاریکردنی توێژەر بۆ تەواوکردنی ئەرکە زانستیەکەی.
3. ئامادەییەکی گونجاو هەبو لەلایەن منداڵانی باخچەی منداڵانی کازیوە، لەڕوی کۆمەڵایەتی و ئابوری و ڕۆشنبیرییەوە کە تاڕادەیەکی زۆر نزیکبون لەیەکەوە.

---

[1] - بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی سلێمانی، هۆبەی ئامار.

**خشتەی (1) نموونەی توێژینەوە**

| گروپ | نێر | مێ | گشتی |
|---|---|---|---|
| گروپی ئەزموونی | 10 | 10 | 20 |
| گروپی کۆنترۆڵکراو | 10 | 10 | 20 |
| کۆی گشتی | 20 | 20 | 40 |

### 4-3 کۆنترۆڵکردنی گۆڕاوەکان

توێژەر هەوڵیداوە گۆڕاوەکانی توێژینەوەکەی هاوتـا بکات، دواجـار ڕەنگدانـەوەی دەبێـت لەسـەر دەرەنجـامی توێژینەوەکـە، ئەمـەش لـەپێناو هاوتـاییکردنی گروپـەکان و دڵنیـابون لـە ڕاستگۆیی و نەگۆڕی ئەنجامی توێژینەوەکە، لەبەرئەوەی توێژەر هەوڵیداوە لە چەند ڕویەکەوە نموونەی توێژینەوەکەی هاوتا بکات (تەمەن، پیشەی دایك و باوك، بڕوانامەی دایك و باوك)

### 1-4-3 تەمەن

توێژەر بۆئەوەی هاوتایی لە نێوان تەمەنی نموونـەی توێژینەوەکـەدا دیاریبکـات، زانیـاریی دەربارەی ئەو گۆڕاوانە کۆکردەوە ئەویش دوای گەڕان بەدۆسیەی منداڵان لە باخچەکـەیان، بـە تایبـەت ئـەو زانیاریانـەی کـە تـوێژەر پێویسـتی پێـی بـو، لەبەرئـەوەی فـۆڕمێکی زانیـاریی ئامادەکردوو دای بە منداڵانی نموونـەی توێژینەوەکـەی  دوای تۆمـارکردنی داتـاو زانیارییـەکان بەپێی (ڕۆژ، مانگ، ساڵ) تا بەرواری (2022/3/23) وەك لە پاشـکۆی (2) خراوەتـەڕو، تـوێژەر (T -test)ی بەکارهێنا بۆ شیکاریی زانیارییەکان و گەیشتن بە ئـەنجام لـە دیـاریکردنی تەمـەنی منداڵان، وەك لە خشتەی (2)دا خراوەتەڕو.

**خشتەی (2) هاوتاکردنی نموونەی توێژینەوەکە بۆ گۆڕاوی تەمەن**

| گروپەکان | ناوەندی ژمێرەیی | لادانی پێوەری | نمرەی ئازاد | بەهای تا: هەژمارکراو | بەهای تا: خشتەیی | بەهای بەڵگەداری | بەڵگەداری |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| تەمەن ئەزمون | 80.35 | 3.64 | 19 | 1.122 | 2.093 | 0.839 | بەڵگەداری نییە |
| تەمەن کۆنترۆڵ | 80.5 | 3.48 | | | | | |

ئەنجامەکـە  ئـەوە ڕوندەکاتـەوە، کـە بـەهای خشـتەیی هـەژمارکراو بریتیـە لـە (0.122) و بەهای خشتەیی بریتیە لە (2.093) کەواتە بەهای هەژمارکراو بچووکترە لە بـەهای خشـتەیی،

کەواتە ئاستی ئاماریی بەڵگەداری نیـە لـە نێـوان گۆڕاوی تەمـەنی نموونـەی توێژینەوەکـە بـۆ هـەردوو گروپـی توێژینەوەکـە (کـۆنترۆڵکراوو ئـەزموونی)، ئەمـەش ئـەوە دەگەیـەنێت کـە گروپەکان هاوتان لە گۆڕاوی تەمەن بەپێی هەژمارکراوی مانگ.

**2-4-2 بڕوانامەی باوك**

(الحموي، 2010) - سەبارەت بە ئاستی خوێندن دەڵێت: ئاستێکی دیاریکراوی دەستکەوتە، لە بەدەستهێنانی بڕوانامـە کە پێوانـە و هەڵسـەنگاندن دەکرێـت بە تـاقیکردنەوە بەشـێوەیەکی بەرنامە بۆداڕێژراو. (الحمـوي، 2010 :180). تـوێژەر نمـرەی ئاسـتی خوێنـدنی بـەپێی جـۆری بڕوانامەکانی دابەشـکرد بـۆ (پێـنج) ئاسـت ئـەوانیش (سـەرەتایی، ناوەنـدی، ئامـادەیی، دبلـۆم، بەکالۆریوس) وەك لە پاشکۆی (2) خراوەتـەڕو، بـە بـەکارهێنانی بـەهای (F) شـیکاریی بـۆ داتـا بەدەستهاتووەکان کراوە و خراوەتەڕو.

**خشتەی (3) بەهای (F) دووبارە بونەوەی ئاستی خوێندنی باوکان لای گروپەکانی توێژینەوەکە**

| سەرچاوەی جیاوازی | کۆی دوجاکان | نمرەی ئازاد | دوجای ناوەند | بەهایF | | بەڵگەداری |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | هەژمارکراو | خشتەیی | |
| لەناوگروپ دا | 19.333 | 15 | 1.289 | 2.224 | 3.056 | 0.115 |
| لەنێوان گروپ دا | 11.467 | 4 | 2.867 | | | |
| گشتی | 30.800 | 19 | | | | |

ئەنجامەکە ئەوە ڕوندەکاتەوە کە بەهای (F)ی هەژمارکراو کە بریتیە لە (2.224) و بەهای خشتەی کە بریتیە لە (3.056)، ئەوە دەگەیەنێت کە بـەهای هـەژمارکراو بچـووکترە لـە بـەهای خشتەیی، کەواتە ئاستی ئاماریی بەڵگەداریی نیە لە نێوان ناوەندی ئاستی خوێندنی باوکان بـۆ بڕوانامە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە گروپەکان هاوتان لە گۆڕاوی بڕوانامەی باوکان.

**3-4-2 پیشەی باوك**

(باشـی، 2019) بـەم شـێوەیە پێناسـەی پیشـە دەکـات: بریتیـە لـە هەنـدێك لـە چـالاکی جۆراوجۆر لە بوارە جیاوازەکاندا، یان بریتیە لە خزمەتگوزاری کـە مەبەسـت لێـی لێهاتوویی و ئارەزوو کارامەیی لە کارێکدا کە مرۆڤ وەك پسپۆڕی تێیدا کار دەکات و شێوەیەکی بەردەوامی هەیە بـۆ ماوەیـەکی درێـژ. (باشـی، 2019 : 108)، نمـرەی پیشـەی باوکـان کـە بـە پێـی جـۆری

پیشەکان دانراوون و بریتین لە دوو پیشە (فەرمانبەر، کاسب) وەك لە پاشكۆی (2) خراوەتەڕو، توێژەر بۆ شیکاریی داتا بەدەستهاتووەکان بەهای (دوجای کای سکوێر)ی بەکارهێناوە، وەك لە خشتەی (4) هاتووە.

**خشتەی (4) بەهای (کای سکوێر) دووبارە بونەوەی پیشەی باوکان لای گروپەکانی توێژینەوەکە**

| گروپ | ژمارە | فەرمانبەر | کاسب | نمرەی ئازاد | بەهای کا2 | | بەڵگەداری |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | هەژمارکراو | خشتەیی | |
| کۆنترۆڵکراو | 20 | 2 | 18 | 1 | 2.5 | 3.841 | بەڵگەدار نیە |
| ئەزمونی | 20 | 6 | 14 | | | | |
| گشتی | 40 | 8 | 32 | | | | |

ئەنجامەکە ئەوە ڕوندەکاتەوە بەهای (کای سکوێر)ی هەژمارکراو بریتیە لە (2.5) و بەهای خشتەی کە بریتیە لە (3.841)، ئەوە دەگەیەنێت بەهای هەژمارکراو بچووکترە لە بەهای خشتەیی، کەواتە ئاستی ئاماریی بەڵگەداریی نیە لە نێوان ناوەندی پیشەی باوکان، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە گروپەکان هاوتان لە گۆڕاوی پیشەدا.

### 3-4-2 بڕوانامەی دایك

توێژەر نمرەی ئاستی خوێندنی بەپێی جۆری بڕوانامەکانی دابەشکرد بۆ (پێنج) ئاست ئەوانیش (سەرەتایی، ناوەندی، ئامادەیی، دبلۆم، بەکالۆریوس) وەك لە پاشکۆی (2) خراوەتەڕو، بە بەکارهێنانی بەهای (F) شیکاریی بۆ داتا بەدەستهاتووەکان کراوە و خراوەتەڕو.

**خشتەی (5) بەهای (F) دووبارە بونەوەی ئاستی خوێندنی دایك لای گروپەکانی توێژینەوەکە**

| سەرچاوەی جیاوازی | کۆی دوجاکان | نمرەی ئازاد | دوجای ناوەند | بەهای F | | بەڵگەداری |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | هەژمارکراو | خشتەیی | |
| لەناوگروپ دا | 20.617 | 15 | 1.374 | 2.025 | 3.056 | 0.142 |
| لەنێوان گروپ دا | 11.133 | 4 | 2.783 | | | |
| گشتی | 31.750 | 19 | | | | |

ئەنجامەکە ئەوە ڕوندەکاتەوە بەهای (F)ی هەژمارکراو بریتیە لە (2.025) و بەهای خشتەی (3.056)، ئەوە دەگەیەنێت کە بەهای هەژمارکراو بچووکترە لە بەهای خشتەیی، کەواتە ئاستی ئاماریی بەڵگەداریی نیە لە نێوان ناوەندی ئاستی خوێندنی دایکان بۆ بڕوانامە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە گروپەکان هاوتان لە گۆڕاوی بڕوانامەی دایکان.

### 3-4-2 پیشەی دایك

نمرەی پیشەی دایکان بە پێی جۆری پیشەکان دانراون و ئەوانیش (فەرمانبەر، کابانی ماڵ) وەك لە پاشکۆی (2) خراوەتەڕو، توێژەر بۆ شیکاریی داتا بەدەستهاتووەکان بەهای (دوجای کای سکوێری بەکارهێناوە، وەك لە خشتەی (6) هاتووە.

**خشتەی (6) بەهای (کای سکوێر) دووبارە بونەوەی پیشەی دایکان لای گروپەکانی توێژینەوەکە**

| گروپ | ژمارە | فەرمانبەر | کابانی ماڵ | نمرەی ئازاد | بەهای کا2 | | بەڵگەداری |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | هەژمارکراو | خشتەیی | |
| کۆنترۆڵکراو | 20 | 1 | 19 | 1 | 2.05 | 3.841 | بەڵگەدار نیە |
| ئەزمونی | 20 | 4 | 16 | | | | |
| گشتی | 40 | 5 | 35 | | | | |

ئەنجامەکە ئەوە ڕوندەکاتەوە بەهای (کای سکوێر)ی هەژمارکراو بریتیە لە (2.05) و بەهای خشتەیی (3.841)، ئەوە دەگەیەنێت بەهای هەژمارکراو بچووکترە لە بەهای خشتەیی، کەواتە ئاستی ئاماریی بەڵگەداریی نیە لە نێوان ناوەندی پیشەی دایکان، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت گروپەکان هاوتان لە گۆڕاوی پیشەدا.

### 5-3 ئامرازەکانی توێژینەوە :

دوای ئەوەی توێژەر هەستا بە خوێندنەوەی ئەدەبیات و توێژینەوەکانی پێشوو کە پەیوەندیدارن بە بابەتی توێژینەوەکەوە، پاشخانی زانستی بۆ دروست بو کە یارمەتیدەر بو لە دیاریکردنی ئامانجەکانی توێژینەوەکە، بەوپێیەی ئامانجەکانی توێژینەوەکە جەختدەکاتەوە لەسەر کاریگەری چیرۆك لە گەشە پێدانی بەها ئاکارییەکان لای منداڵانی باخچە، ئەمەش

دەرخەری ئەو ڕاستییەیە کە توێژینەوەکە بەسروشتی خۆی لە ئامرازێـك زیـاتری پێویسـتە، بـۆ ئەو مەبەستە توێژەر دوو پێوەری بنیاتناوە بەم شێوەیەی خوارەوە:

### 1-5-3 پێوەری بەها ئاکارییەکان

توێژەر هەستاوە بە ئامادەکردنی پێوەرێك بە پشت بەستن و سود وەرگرتن لە پێـوەری ئەو توێژینەوانەی پەیوەستن بە گەشەپێدانی هەندێك چەمكی بەهـای ئاکـاری، پێـوەرەکە ڕەچـاوی ڕێنمـای و ڕێسـاو یاسـاکانی تـاقیکردنەوە بابەتییەکـانی کـردووە کە پێکهـاتووە لە هەڵبژاردنـی ڕەفتارێك لەگەڵ دیاریکردنی هۆکارەکەی.

**داڕشتنی بڕگەکانی پێوەری بەها ئاکارییەکان :**

بڕگەکانی پێوەرەکە بەجۆرێك داڕێژراوە هەموو پرسیارێك یەکێك لەو هەڵبژاردنەیە کە بـۆ پرسیارەکە دانراوە، هەروەها ڕونی و دروسـتی لە داڕشـتنی زمـانەوانی پرسـیارەکان، هەروەهـا دەسـتەبەرکردنی زانیـاری و توانـای تێگەیشـتن لە پرسـیارەکان، دەستنیشـانکردنی ڕاسـتی و جێگیـری پێـوەری تـوێژینەوەکە، بەمەبەسـتی پێـوانەکردنی بەهـا ئاکارییەکـان لای منـداڵانی باخچە، توێژەر پێوەرێکی ئامادەکردووە کە خـۆی لـە (5) بـواردا دەبینێتـەوە وەك لـە خشـتەی (7)دا خراوەتەڕو، هەر بوارێك لە چەند بڕگەیەك پێکهاتووە، لەبەرامبەر هەر بڕگەیەکدا وەڵامی چاوەڕوانکراوی بۆ ئامادەکراوە کە بریتیە لە دوو بژاردە، پاشکۆی (3).

**خشتەی (7) بوار و ژمارەی بڕگەکانی پێوەری بەها ئاکارییەکان**

| ز | بوار | ژمارەی بڕگە |
|---|---|---|
| 1 | دەستپاکی و ڕاستگۆیی | 5 |
| 2 | یارمەتی و هەرەوەزی | 4 |
| 3 | گوێڕایەڵی و پابەندبون بە سیستم | 3 |
| 4 | بواری میهرەبانی و هەستکردن بە بەرپرسیاریەتی | 4 |
| 5 | بواری پارێزگاریکردن لە کەلوپەلە گشتییەکان و تایبەتییەکان | 4 |
| | کۆی بڕگەکان | 20 |

### 1-1-5-3 ڕاستگۆیی ڕواڵەتی (Face Validity)

مەبەست لە ڕاستی ڕواڵەتی ئامڕازی توێژینەوە، ئایا ئامڕازەکە لە ڕواڵەتدا، تاچەند بابەتەکە دەپێوێت، بۆ ئەو مەبەستەش بڕگەو پرسیارەکان، ڕای پسپۆڕو شارەزای بوارەکە وەردەگیرێت دەربارەی پێوەرەکە، بۆ ئەوەی ڕای خۆیان لەسەر باش و خراپی و هەمواركردن دەرببڕن (بۆکانی، 2016 :174).

توێژەر بەمەبەستی دیاریکردنی ڕاستی ئامڕازەکەو دڵنیابون لە ئاستی زانستی پێوەرەکە، کە تا چەند بڕگەکانی بەڕونی وبەوردی داڕێژراون و لە توانایاندا هەیە چەمکی بەها ئاكارییەکان لای منداڵانی باخچە پێوانە بکەن ، بۆ ئەو مەبەستە بڕگەکانی پێوەرەکە لە (20) بڕگە پێکهاتووە خرایە بەردەستی ژمارەیەك لە شارەزایان وپسپۆڕانی بواری پەروەردەو ڕێگەکانی وانەوتنەوەو دەروناسی کە ژمارەیان (9) پسپۆڕ بون، پاشکۆی (4).

توێژەر کۆدەنگی نێوان پسپۆڕەکانی بۆ دیاریکردنی ئاستی گونجاوی و بڕگەکانی فۆڕمی تێبینیەکە وەرگرتووە و پەسەندکردنی هەر بڕگەیەك لە بڕگەکانی فۆڕمەکەی وەرگرتووە ،کە ڕێژەکەی دەگاتە (0/085)ی کۆدەنگی پسپۆڕەکان، دوای ئەوەی ڕاوبۆچوون و سەرنج و تێبینی و پێشنیازی شارەزاو پسپۆڕان، بە بەکارهێنانی ($x^2$) کای سکوێر دەرکەوت کە سەرجەم بڕگەکان پەسەندن، وەك لە خشتەی (8) دا خراوەتەڕو.

**خشتەی (8) ڕاستی ڕواڵەتی بڕگەکان**

| ژ | بڕگەکان | ژمارەی بڕگەکان | ڕەزامەند | ڕەزامەندنین | بەهای کا2 | بەڵگەداری |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | ژمارەی پسپۆڕ | ژمارەی پسپۆڕ | | |
| 1 | 1، 3 ، 4 ، 6، 8، 10 ، 11 ، 12،13، 14، 15 ،17،18، 19، 20 | 14 | 9 | 0 | 9 | بەڵگەدارە |
| 2 | 2، 5، 7، 9، 16 | 6 | 8 | 1 | 5.444 | |

خشتەی (8) ڕاستی ڕواڵەتی بڕگەکانی پێوەری بەها ئاکارییەکان ڕوندەکاتەوە، بەشێوەیەکی گشتی سەرجەم بڕگەکان ئاستی بەڵگەدارییان هەیە. (14) بڕگە لەلایەن (9) پسپۆڕ و شارەزاوە بەڕێژەی (100%) قبوڵکراون و بەبێ هیچ گۆڕانکارییەك ، بەڕێژەی (88.89%) قبوڵکراوون، ئەویش دوای داڕشتنەوە و چاکردنی هەندێك لە بڕگەکان.

### 2-1-5-3 جێگیری (Reliability)

جێگیری بەو مانایەدێت، پێوەرەکە یان ئامڕازەکە چەند جار لەگەڵ هەمان گروپ و سامپڵ و لەهەمان هەلومەرجدا جێبەجێ بکرێت ، دەبێت هەمان ئەنجام بەدەستەوە بدات .چەمکی جێگیری بەو واتایە دێت، کە ئامرازەکە بتوانێت هەمان ئەنجام بەدیبهێنێت ئەگەر دووجار بەسەر هەمان گروپدا جێبەجێبکرێتەوە .(بۆکانی ،2016، 177)

بۆ دۆزینەوەو زانینی ڕادەی جێگیریی ئامرازی توێژینەوە چەند ڕێگەیەك هەیە، یەکێك لەوانە: ڕێگای تاقیکردنەوەو دووبارە تاقیکردنەوەیە، کە تا ڕادەیەك لە ڕێگەکانی دیکە باوترە، بۆ دەرخستنی ڕادەی جێگیری پێوەری بە ها ئاکارییەکان ئەم ڕێگەیە بە گونجاو زانراوە، بۆ ئەم مەبەستەش توێژەر هەستا بە ئەنجامدانی پێوەری بەها ئاکارییەکان لەسەر (20) منداڵی باخچە، کە بەشێوەی هەڕەمەکی وەرگیراون، لە کاتی جێبەجێکردنی پێوەرەکە بەسەر منداڵانی باخچەدا چونیەکە، ڕێنمای درا بە منداڵەکان لەسەر چۆنیەتی وەڵامدانەوەی پرسیارەکان دوای تێپەڕبونی (15) ڕۆژ بەسەر جێبەجێکردنی تاقیکردنەوەی یەکەمدا، توێژەر هەستا بە دووبارە جێبەجێکردنەوەی پێوەرەکە لەسەر هەمان نمونە، دوای سەیرکردنی فۆڕمەکان، توێژەر بۆ ڕادەی جێگیری ئامڕازی پێوەرەکە و دۆزینەوەی پەیوەندی نێوانیان هاوکۆلکەی پەیوەندی (پێرسۆن)ی بەکارهێناوە کە ئەنجامەکەی گەیشتە (86.4) ئەم نمرەیە دەریدەخات کە پێوەری توێژینەوەکە جێگیرە.

### 3-1-5-3 ڕێنمایی پێوەری بەها ئاکارییەکان

پرسیارەکانی پێوەرەکە بەشێوەی زارەکی و یەك یەك دەخوێنرێتەوەو ڕوندەکرێتەوە بۆ منداڵەکان هەتا دڵنیا دەبین سەرجەم منداڵەکان تێگەیشتوون، لەوەی کە داوایان لێکراوە بەشێوەیەك کە (2) نمرە بۆ وەڵامی ڕاست لەگەڵ پاساوی ڕاست (1) نمرە کە تەنها وەڵامەکەی

ڕاستە بەبێ پاساو (صفر) بۆ وەڵامی هەڵە واتە بەرزترین نمرەی پێوەرەکە (40) نمرەیە ونزمترین نمرە (0).

### 2-5-3 چیرۆکی پەروەردەیی:

بۆ پێوانەکردنی کاریگەری چیرۆك لە گەشەپێدانی بەها ئاکارییەکان لای منداڵانی باخچە، توێژەر هەستا بە ئامادەکردنی (7) چیرۆك کە بەها ئاکارییەکانی لە خۆیدا کۆکردبویەوە، توێژەر پشتی بەستووە بە چەند سەرچاوەیەکی چیرۆك بۆ ئامادەکردنی چیرۆکەکان وەك لە پاشکۆی (5) خراونەتەڕو، ناوی چیرۆکەکانیش بریتین لە:

1. چیرۆکی (فیلی بچووك)، باس لە یارمەتی و هەرەوەزی دەکات (ئاسۆ، 2012 :22).
2. چیرۆکی (پێنووسە ونبوەکە)، باس لە دەستپاکی دەکات (شاسوار، 2021 :33).
3. چیرۆکی (هاوڕێی ڕاستەقینە)، کە باس لە ڕاستگۆیی دەکات. (بەرهەم، ب.س :11)
4. چیرۆکی (خەڵاتەکە)، باس لە گوێڕایەڵی و پابەندبون بە سیستم دەکات (شاسوار، 2021 :9).
5. چیرۆکی (دیارییەکەی نانسی)، کە باس لە هەستکردن بە بەرپەرسیاریەتی دەکات (بەرهەم، ب.س :3).
6. چیرۆکی (ورچەکەی لیلي) کە باس لە پارێزگاریکردن لە کەلوپەلە گشتی و تایبەتییەکان دەکات (بەرهەم، ب.س :11).
7. چیرۆکی (هەرگیز ئازاری گیانلەبەران مەدە)، باس لە میهرەبانی دەکات (شاسوار، 2021 :33).

پاشان توێژەر بۆ ناوەڕۆکی چیرۆکەکان فۆڕمێکی ئامادەکرد بۆ دیاریکردنی گونجاوی ناوەڕۆکی چیرۆکەکان بۆ منداڵانی باخچە لەسەر بوارەکانی چیرۆکەکان (ڕاستگۆی و دەستپاکی، یارمەتی و هەرەوەزی ، گوێڕایەڵی و پابەندبون بەسیستەم، میهرەبانی وهەستکردن بە بەرپرسیارییەتی، پارێزگاریکردن لە کەلوپەلە گشتی و تایبەتەکان) وەك لە پاشکۆی (5)دا خراوەتەڕو.

## 3-5-2-1 ڕاستی ڕواڵەتی چیرۆکەکان

توێژەر بەمەبەستی دیاریکردنی ڕاستی ئامرازەکەو دڵنیابون لە ئاستی زانستی چیرۆکەکان، کە تا چەند دەقەکان بەڕونی و بەوردی داڕێژراون و لە توانایاندا هەیە چەمکی بەها ئاکارییەکان پێوانە بکات لای منداڵانی باخچە، بۆ ئەو مەبەستە چیرۆکەکان لە (7) چیرۆك پێکهاتووە خراونەتە بەردەستی ژمارەیەك لە شارەزایان و پسپۆڕانی بواری پەروەردەو دەروونناسی و ڕێگاکانی وانەوتنەوەو کە ژمارەیان (9) پسپۆڕە ، پاشکۆی (7). دەرکەوت کە ڕاستی ڕواڵەتی بۆ چیرۆکەکان لەئاستێکی بەڵگەداریدایە، خشتەی (9).

**خشتەی (9) ڕاستی ڕواڵەتی چیرۆکەکان**

| چیرۆکەکان | بڕگەکان | ژمارەی بڕگەکان | ڕەزامەند | | ڕەزامەند نین | | بەهای کا2 | | بەڵگەداری |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | ژمارەی پسپۆڕ | ڕێژەی سەدی | ژمارەی پسپۆڕ | ڕێژەی سەدی | خشتەی | هەژمارکراو | |
| 1 | 1،2،3 | 3 | 8 | 88.89% | 1 | 11.11% | 5.444 | 3.84 | بەڵگەدارە |
| | 4 | 1 | 8 | 88.89% | 1 | 11.11% | 5.444 | 3.84 | |
| 2 | 1،2،3،4 | 4 | 9 | 100 % | 0 | 0.00% | 9 | 3.84 | |
| 3 | 1،3،4 | 3 | 8 | 88.89% | 1 | 11.11% | 5.444 | 3.84 | |
| | 2 | 1 | 8 | 88.89% | 1 | 11.11% | 5.444 | 3.84 | |
| 4 | 1،2،3،4 | 4 | 9 | 100 % | 0 | 0.00% | 9 | 3.84 | |
| 5 | ،2،3،4 | 3 | 8 | 88.89% | 1 | 11.11% | 5.444 | 3.84 | |
| | 1 | 1 | 8 | 88.89% | 1 | 11.11% | 5.444 | 3.84 | |

## 3-5-3 ئامادەکردنی پلانی ڕۆژانە

پلان بریتییە لە کۆمەڵێك هەنگاوی پێشبینیکراوی عەقڵی بۆ ئەو کارامەییو چالاکیانەی پێویستە لەپرۆسەی پەروەردەو فێرکردن ئەنجامبدرێن، یان جێبەجێ بکرێن لەکاتو شوێنی دیاریکراو، بۆ بەرجەستەکردنی ئامانجە دیاریکراوەکان، بەبەکارهێنانی سوود بینین لە هۆکارو ئامرازو تەکنەلۆژیای فێرکاری بە کەمترین هەوڵو تێچوون (حەمەدەمین، 2018: 26).

توێژەر لەبەرئەوەی بەپێویستی زانیوە کە (7) پلان دابڕێژێت و ئامادەی بکات، وەکو نمونە بۆ جێبەجێکردنی وانەوتنەوەی ئەزموونی لەباخچەی منداڵانی کازیوە وەك لە پاشکۆی

(8) دیارە، توێژەر (7) پلانی بۆ خستنەڕوی چیرۆکەکان ئامادەکردووە بۆ گروپی ئـەزموونی تـا بتوانێت لەکاتی گونجاوی خۆیدا پێشکەشی منداڵانی بکات، ئەویش بەپێی ئـەو کاتـەی کـە بـۆ یەك وانە دیاریکراوە کە (30) خولەك بوە، بۆ گروپی کۆنترۆڵکراویش توێژەر بۆ وانەی (یەکـەی نیشمانەکەم) کە باس لە بۆنەو جەژنـەکان دەکـات پلانـی دانـاوە وەك لـە پاشـکۆی ژمـارە (9)دا دیارە.

**خشتەی (10) دیاریکردنی بەشەوانەکان (لەهەفتەیەکدا )**

| ڕۆژەکانی هەفتە | وانەی یەکەم | وانەی دووەم | وانەی سێیەم | وانەی چوارەم | وانەی پێنجەم | وانەی شەشەم |
|---|---|---|---|---|---|---|
| شەممە | | | | | | |
| 1 شەممە | | ژووری هەنار | چیرۆك ژووری هەرمێ | | | |
| 2 شەممە | ژووری هەنار | | چیرۆك ژووری هەرمێ | | | |
| 3 شەممە | | | | | | |
| 4 شەممە | ژووری هەنار | | چیرۆك ژووری هەرمێ | | | |
| 5 شەممە | | | | | | |

**6-3 هەنگاوەکانی جێبەجێکردنی ئەزموونی توێژینەوەکە**

توێژینەوەکـە بـەم شـێوەیە جێبـەجێکرا، تـوێژەر ئەزموونەکـەی لـە ڕۆژی (2022/4/3) ئەنجامدا، ڕۆژی یەکەم وەك یەکتر ناسین لەگـەڵ منداڵـەکان و ئامـادەکردنی فـۆڕم و زانیـاریی لەسەر منداڵەکان دیاریکردنی ژووری (هەنار) وەکو گروپی کـۆنترۆڵکراو ژووری (هـەرمێ) وەك گروپی ئەزموونی، هەڵبژاردنی (40) منداڵ بەشێوەی هەڕەمەکی لە هەر ژوورێك (20) منـداڵ، پاشان لە (2022/4/3) توێژەر دەستیکرد بە تاقیکردنەوەی پێشەکی بۆ هەردوو گروپ، گروپی ئـەزموونی چیرۆکیـان پێشکەشکراوە گروپـی کـۆنترۆڵکراو وانـەی ئاسـاییان پێشکەشـکرا کـە

تایبەتبو بە پرۆگرامی باخچە، بە جۆرێك هەفتەی (3) رۆژ لە کاتژمێر (10:30) بۆ ماوەی نیو کاتژمێر، وانەی چیرۆکیان پێشکەشکرا (5) خولەکی سەرەتا بۆ ڕۆژباش و چۆنیەتی ڕێکخستنی منداڵەکان (20) خولەك بە خوێندنەوەی چیرۆك بە نیشاندانی فلاشکارت و وێنەی ناو چیرۆکەکە بە گۆڕین و بەرزکرنەوە و نزمکردنەوەی دەنگ، هەروەها (5) خولەکی کۆتایی بۆ پرسیارکردن لە بارەی چیرۆکەکەو کەسایەتییەکانی ناو چیرۆکەکە بۆ هەڵسەنگاندنی منداڵەکان، بەو شێوەیە هەموو چیرۆکەکان پێشکەشکران، لە (2022/4/17) کۆتایی بە پرۆسەی وانەوتنەوە هات بۆ هەردوو گروپەکە، پاشان لە (2022/5/3) تاقیکردنەوەی پاشەکی بۆ هەردوو گروپ (کۆنترۆڵکراوو ئەزموونی) ئەنجامدرا.

### 7-3 هاوکێشە ئامارییەکان

توێژەر بۆ چارەسەرکردنی ئامار و شیکردنەوەی زانیاری و داتا بەدەستهاتووەکان پشتی بە پرۆگرامی (spss) بەستووە بۆ شیکاریی داتاو زانیارییەکان، ئەو هاوکێشە ئامارییانەی کە توێژەر بەکاریهێناون بریتین لە:

1. **هاوکۆلکەی پەیوەندی پێرسۆن: بۆ دۆزینەوەی جێگیریی ئامرازی توێژینەوەکەو زانینی پەیوەندی نێوانیان: (قەرەچەتانی، 2018 :204)**

$$\text{ر} = \frac{\text{ن مج س ص} - \text{مج س} \times \text{مج ص}}{\sqrt{[\text{ن مج س}^2 - (\text{مج س})^2]\ [\text{ن مج ص}^2 - (\text{مج ص})^2]}}$$

ر = بەهای ژمێراو

ن = قەبارەی نموونەیەك

مج س ص = کۆی نمرەی دوو گروپ

2. **هاوکۆلکەی ئاماری (تی تێست ) ( t - test ) معادلة الإختبار التائي: (عودة و الخليل، 1988 :228)**

بەمەبەستی دۆزینەوەی ناوەندە ژمێرەیی کۆمەڵەکان و دۆزینەوەی قەبارەی کاریگەریی پرۆگرامە فێرکاریەکە، لە دروستکردنی ئاڕاستەکانی خوێندکارانی کۆمەڵەی ئەزموونیدا،

بەرامبەر بە بابەتی ڕەخنە و چێژی هونەریدا بەکارهاتووە، کە ئەم لایەنانەی خوارەوە لە خۆدەگرێت:

س̄ = ناوەندی ژمێرەی نموونەی یەکەم

أ = ناوەندی ژمێرەی نموونەی دووەم

ع = لاربونەوەی پێوانەی نموونەیەك.

ن = قەبارەی نموونەیەك

3. **بۆ دۆزینەوەی جیاکاری (بەراوردکاری فرەیی) (LSD) ئەم یاسایە پەیڕەوکراوە:**

$$ع^2 = \frac{\text{مج}(\text{س}-\text{س}-1)^2}{\text{ن}-1}$$

4. **هاوکێشەی ئەنۆڤا یەک ئاڕاستە (One Way ANOVA)** بۆ دۆزینەوەی جیاوازی بۆ گۆڕاوەکانی(بڕوانامە، ساڵانی خزمەت، پسپۆڕی) هەردوو فۆڕمی مامۆستایان و هاوڕێیانی ڕەخنەگر.

$$F = \frac{MST}{MSE}$$

$$MST = \frac{\sum_{i=1}^{k}(T_i^2/n_i) - G^2/n}{k-1}$$

$$MSE = \frac{\sum_{i=1}^{k}\sum_{j=1}^{n_i} Y_{ij}^2 - \sum_{i=1}^{k}(T_i^2/n_i)}{n-k}$$

(قەرەچەتانی، 2018، 345)

# بەشی چوارەم

## خستنەڕوی ئەنجام و ڕاڤەو شیکردنەوەیان

### 1-4 ئەنجامەكانی توێژینەوە

لـەم بەشـەدا ئەنجامـەكانی توێژینەوەكـە لەبـەر ڕۆشـنایی ئامـانج و گریمانـەی توێژینەوەكـە دەخرێنـەڕو كـە تـوێژەر لـە بەشـی یەكـەمی توێژینەوەكەیـدا خسـتوویەتیيە ڕو سـەبارەت بـە كاریگەریی گێڕانەوەی چیرۆك لە گەشەپێدانی بەها ئاكارییەكان لای منداڵانی باخچە.

### 1-1-4 ئامانجی یەكەم زانینـی كاریگـەریی چیـرۆك لـە گەشـەپێدانی بـەها ئاكارییـەكان لای منداڵانی باخچە ئاستی دووەم تەمەن(5ساڵ)

توێژەر لەڕێگەی هاوكۆلكە ئامارییەكانەوە بۆ دۆزینەوەی داتا ئامارییەكانی ناوەندە ژمێرەیی گروپی ئەزموونی سەبارەت بە پێوەری بڕگەكان لە تاقیكردنەوەی سەرەتا و كۆتایی دۆزینەوەی لادانی پێـوەریی و نمـرەی ئـازاد بـۆ پێوەرەكـەو هـەروەها دۆزینـەوەی نرخـی (ت) خشـتەیی و هـەژماركراو بـۆ دۆزینـەوەی نمـرەی تاقیكردنـەوەی سـەرەتایی و كۆتـایی منـداڵانی گروپـی ئەزموونی لە تاقیكردنەوەی كاریگەریی چیرۆك لە گەشەپێدانی بەها ئاكارییەكان لای منـداڵانی باخچە، بە بەكارهێنانی تاقیكردنەوەی (t-test) وەك لە خشتەی (11) خراوەتەڕو.

**خشتەی (11) ئەنجامی (t-test) بۆ جیاوازی نێوان ئاستی پێوەرەكانی توێژینەوەكە بۆ تاقیكردنەوەی سەرتایی و كۆتایی پێوەرەكان بۆ گروپی ئەزموونی**

| گروپی ئەزمونی | ناوەندە ژمێرەیی | لادانی پێوەری | نمرەی ئازاد | بەهای تا: هەژماركراو | بەهای تا: خشتەی | بەهای بەڵگەداری |
|---|---|---|---|---|---|---|
| دەستپاكی سەرەتایی | 5.2000 | 1.36111 | 19 | 5.252 | 1.963 | 0.000 |
| دەستپاكی كۆتایی | 6.7000 | 1.30182 | | | | |
| یارمەتی سەرەتایی | 4.4000 | 0.59824 | 19 | 6.175 | 1.963 | 0.000 |
| یارمەتی كۆتایی | 5.8500 | 0.93330 | | | | |
| گوێڕایەڵی سەرەتایی | 3.6000 | 1.18766 | 19 | 5.715 | 1.963 | 0.003 |
| گوێڕایەڵی كۆتایی | 5.0000 | 0.85840 | | | | |
| میهرەبانی سەرەتایی | 5.2000 | 0.69585 | 19 | 3.454 | 1.963 | 0.000 |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| میهرەبانی کۆتایی | 6.1000 | 0.85224 | | | | |
| پارێزگاری یکردن سەرەتایی | 4.8000 | 0.69585 | 19 | 5.542 | 1.963 | 0.000 |
| پارێزگاری یکردن کۆتایی | 6.1500 | 0.74516 | | | | |
| پێوەر سەرەتایی | 23.2000 | 2.60768 | 19 | 12.334 | 1.963 | 0.000 |
| پێوەر کۆتایی | 29.8000 | 2.44088 | | | | |

خشتەی (11) ئامانجی توێژینەوەکە سەبارەت بە زانینی کاریگەری چیرۆك لە گەشەپێدانی بەها ئاکارییەکان لای منداڵانی باخچە ئاستی دووەم تەمەن (5ساڵ) بۆ گروپی ئەزموونی سەبارەت بە پێوەرەکانی توێژینەوەکە دەخاتەڕو، سەبارەت بە جیاوازی ئاستی پێوەرەکە بۆ (دەستپاکی) لە تاقیکردنەوەی سەرەتایی و کۆتایی ئەوە دەردەکەوێت کە بەهای تائی هەژمارکراو بریتیە لە (5.252) بەهای تائی خشتەیی بریتیە لە (1.963) هەروەها ئاستی بەهای ئاماریی بەڵگەداریی بریتیە لە (0.000)، ئەوە دەردەخات جیاوازی هەیە لەنێوان تاقیکردنەوەی سەرەتایی و کۆتایی پێوەرەکە بۆ بواری دەستپاکی، بەو پێیەی کە ناوەندە ژمێرەیی بواری دەستپاکی کۆتایی (6.7000) گەورەترە لە ناوەندە ژمێرەیی بواری دەستپاکی سەرەتایی (5.2000) ئەوە دەردەخات کە تاقیکردنەوەکە لە بەرژەوەندی تاقیکردنەوەی کۆتاییە بۆ بواری دەستپاکی.

سەبارەت بە جیاوازی ئاستی پێوەرەکە بۆ (یارمەتی) لە تاقیکردنەوەی سەرەتایی و کۆتایی ئەوە دەردەکەوێت بەهای تائی هەژمارکراو بریتیە لە (6.175) بەهای تائی خشتەیی بریتیە لە (1.963) هەروەها ئاستی بەهای ئاماریی بەڵگەداریی بریتیە لە (0.000)، ئەوە دەردەخات جیاوازی هەیە لەنێوان تاقیکردنەوەی سەرەتایی و کۆتایی پێوەرەکە بۆ بواری دەستپاکی، بەو پێیەی کە ناوەندە ژمێرەیی بواری یارمەتی کۆتایی (5.8500) گەورەترە لە ناوەندە ژمێرەیی بواری دەستپاکی سەرەتایی (4.4000) ئەوە دەردەخات کە تاقیکردنەوەکە لە بەرژەوەندی تاقیکردنەوەی کۆتاییە بۆ بواری یارمەتی.

سەبارەت بە جیاوازی ئاستی پێوەرەکە بۆ (گوێڕایەڵی) لە تاقیکردنەوەی سەرەتایی و کۆتایی ئەوە دەردەکەوێت بەهای تائی هەژمارکراو بریتیە لە (5.715) بەهای تائی خشتەیی بریتیە لە (1.963) هەروەها ئاستی بەهای ئاماریی بەڵگەداریی بریتیە لە (0.000)، ئەوە دەردەخات جیاوازی هەیە لەنێوان تاقیکردنەوەی سەرەتایی و کۆتایی پێوەرەکە بۆ بواری

گوێڕایەڵی، بەو پێیەی کە ناوەندە ژمێرەیی بـواری یارمـەتی کۆتـایی (5.0000) گـەورەترە لـە ناوەندە ژمێرەیی بواری گوێڕایەڵی سەرەتایی (3.6000) ئەوە دەردەخـات کـە تاقیکردنەوەکـە لە بەرژەوەندی تاقیکردنەوەی کۆتاییە بۆ بواری گوێڕایەڵی.

سەبارەت بە جیاوازی ئاستی پێوەرەکە بـۆ (میهرەبـانی) لـە تاقیکردنـەوەی سـەرەتایی و کۆتـایی ئـەوە دەردەکـەوێت کـە بـەهای تـائی هـەژمارکراو بریتیـە لـە (3.454) بـەهای تـائی خشتەیی بریتیە لە (1.963) هەروەها ئاستی بەهای ئاماریی بەڵگەداریی بریتیە لـە (0.000)، ئەوە دەردەخـات جیـاوازی هەیـە لـەنێوان تاقیکردنـەوەی سـەرەتایی و کۆتـایی پێوەرەکـە بـۆ بواری میهرەبانی، بەو پێیەی کە ناوەندە ژمێرەیی بواری یارمەتی کۆتایی (6.1000) گەورەترە لە ناوەندە ژمێرەیی بواری میهرەبانی سەرەتایی (5.2000) ئەوە دەردەخات کە تاقیکردنەوەکە لە بەرژەوەندی تاقیکردنەوەی کۆتاییە بۆ بواری میهرەبانی.

سەبارەت بە جیاوازی ئاستی پێوەرەکە بۆ (پارێزگاریکردن) لە تاقیکردنـەوەی سـەرەتایی و کۆتـایی ئـەوە دەردەکـەوێت کـە بـەهای تـائی هـەژمارکراو بریتیـە لـە (5.542) بـەهای تـائی خشتەیی بریتیە لە (1.963) هەروەها ئاستی بەهای ئاماریی بەڵگەداریی بریتیە لـە (0.000)، ئەوە دەردەخـات جیـاوازی هەیـە لـەنێوان تاقیکردنـەوەی سـەرەتایی و کۆتـایی پێوەرەکـە بـۆ بواری پارێزگاریکردن، بەو پێیەی کە ناوەندە ژمێرەیی بواری پارێزگاریکردن کۆتایی (6.1500) گەورەترە لە ناوەندە ژمێرەیی بواری پارێزگاریکردن سەرەتایی (4.8000) ئەوە دەردەخات کـە تاقیکردنەوەکە لە بەرژەوەندی تاقیکردنەوەی کۆتاییە بۆ بواری پارێزگاریکردن.

سەبارەت بە کۆی پێوەرەکە بۆ تاقیکردنەوەی سەرەتایی و کۆتایی بە هەژمارکردنی تـائی هـەژمارکراو کـە بریتیـە لـە (12.334) و تـائی خشـتەیی بریتیـە لـە (1.963)، ئاسـتی بـەهای ئامـاریی بەڵگـەداریی بریتیــە لــە (0.000) ئــەوە دەردەخــات کــە جیــاوازی هەیــە لــەنێوان تاقیکردنەوەی سەرەتایی و کۆتایی تاقیکردنەوەی پێوەرەکە، بەو پێیەی کـە ناوەنـدە ژمێرەیـی پێــوەری کۆتــایی بریتیــە لــە (29.8000) و ناوەنــدە ژمێرەیــی پێــوەری ســەرەتا بریتیــە لــە (23.2000)، ئەوە دەردەخات کە تاقیکردنەوەی پێوەرەکە بـۆ کـۆی بوارەکـان لـە بەرژەوەنـدی پێوەری کۆتاییە. ئەم ئەنجامەش هاوتایە لەگـەڵ توێژینـەوەکانی (ابوريخـة، 2013)، الرشـدي، 2017)، (المخمري، 2019).

پاشکۆی (2+1) زانیاریی نموونەی توێژینەوەکە لە گروپی کۆنرۆڵکراودا

| ز | ناوی منداڵ بە کۆد | بەرواری لەدایکبون | ڕەگەز | پیشەی باوک | پیشەی دایک | ئاستی خوێندنی باوک | ئاستی خویندنی دایک |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | 1 | 2016/11/13 | نیر | پۆلیس | کابانی ماڵ | ناوەندی | ناوەندی |
| 2 | 2 | 2016/5/27 | نیر | کاسپ | کابانی ماڵ | ناوەندی | دیبلۆم |
| 3 | 3 | 2016/6/23 | نیر | کاسپ | کابانی ماڵ | دیبلۆم | ئامادەیی |
| 4 | 4 | 2016/3/7 | نیر | کاسپ | کابانی ماڵ | ئامادەیی | بکالوریوس |
| 5 | 5 | 2016/12/17 | نیر | کاسپ | کابانی ماڵ | سەرەتایی | سەرەتایی |
| 6 | 6 | 2016/9/26 | نیر | کاسپ | کابانی ماڵ | ناوەندی | ناوەندیی |
| 7 | 7 | 2016/8/16 | نیر | کاسپ | کابانی ماڵ | سەرەتایی | سەرەتایی |
| 8 | 8 | 2016/4/6 | نیر | کاسپ | کابانی ماڵ | ناوەندی | ئامادەیی |
| 9 | 9 | 2016/11/12 | نیر | کاسپ | کابانی ماڵ | دیبلۆم | بکالۆریۆس |
| 10 | 10 | 2016/2/6 | نیر | کاسپ | کابانی ماڵ | بکالۆریۆس | بکالۆریۆس |
| 11 | 11 | 2016/6/15 | می | کاسپ | کابانی ماڵ | ئامادەیی | ناوەندی |
| 12 | 12 | 2016/7/28 | می | کاسپ | کابانی ماڵ | ئامادەیی | دیبلۆم |
| 13 | 13 | 2016/3/3 | می | پۆلیس | کابانی ماڵ | ناوەندی | ئامادەیی |
| 14 | 14 | 2016/3/15 | می | کاسپ | کابانی ماڵ | ناوەندی | ناوەندی |
| 15 | 15 | 2016/9/7 | می | کاسپ | ژنی مالەوە | سەرەتایی | ئامادەیی |
| 16 | 16 | 2016/3/2 | می | کاسپ | کابانی ماڵ | سەرەتایی | سەرەتایی |
| 17 | 17 | 2016/11/8 | می | کاسپ | کابانی ماڵ | ناوەندی | بنەرەتی |
| 18 | 18 | 2016/11/9 | می | کاسپ | کابانی ماڵ | ئامادەیی | ناوەندی |
| 19 | 19 | 2016/2/6 | می | کاسپ | کابانی ماڵ | دیبلۆم | ئامادەیی |
| 20 | 20 | 2016/4/20 | می | کاسپ | کابانی ماڵ | سەرەتایی | ناوەندی |

## پاشکۆی (3) فۆڕمی پێوەرەکە

**وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی**

**زانکۆی سلێمانی**

**کۆلێجی پەروەردەی بنەڕەت**

**بەشی باخچەی منداڵان**

**خوێندنی باڵا/ماستەر**

پاش سڵاو ڕێز......

توێژەر هەڵدەستێ بە ئەنجامدانی توێژینەوەیەك بە ناونیشانی ( **کاریگەریی چیرۆك لەگەشەپێدانی بەها ئاکارییەکان لای منداڵانی باخچە**) بەپشت بەستن بەپێداچونەوە بەئەدەبیاتی توێژینەوەکانی پەیوەندیدار بە بابەتی توێژینەوەکە و ئەو پێوەرانەی لەم بوارەدا بەکارهێنراون ،توێژەر پێوەرێکی ئامادە کردووە کەژمارەیەك پرسیار لەخۆ دەگرێت تایبەت بە گەشەی ئاکاری (بەها) ئێوەی بەڕێزیش وەك مامۆستایەکی پسپۆڕ و شارەزا لەبوارەکەدا، بەبۆچونتان ئەم پێوەرە بۆ پێوانە کردنی ئەم کاریگەرییە گونجاوە یان پێویستی بە زیادکردن و گونجاندن هەیە ،ئەوەی توێژەر مەبەستییەتی لایەنی ئاکارییە ئەو((هەڵسوکەوتانەیە کەڕادەی پابەندبونی منداڵان دەردەخات لە ژیانی ڕۆ ژانەیدا )، پێوەرەکە لەپێنج ڕەهەندپێکهاتووە، (ڕاستگۆیی ودەستپاکی، یارمەتی وهەرەوەزی، گوێڕایەڵی وپابەندبون بەسیستەم، میهرەبانی و هەستکردن بە بەرپرسیارییەتی، پارێزگاریکردن لە کەلوپەلە گشتی و تایبەتەکان) هەر ڕەهەند یێکیش چەند پرسیارێکی لەخۆگرتووە ،توێژەر سێ جێگرەوەی داناوە بۆ وەڵامدانەوەی منداڵەکان کە ئەمانەن :(دوو)نمرە بۆ ئەو منداڵەی کە وەڵامەکەی ڕاستەو پاساوی بۆ وەڵامەکەی هەیە.(یەك)نمرە دەدرێت بەو منداڵەی کە تەنها وەڵامەکەی ڕاستەو پاساوی نیە .(سفر)دادەنرێت بۆ وەڵامی هەڵە.توێژەر پرسیارەکانی بۆ هەموو منداڵێك بەتەنها دەکات بەشێوەی چاوپێکەوتن بەوشێوازەی کەمنداڵەکە لێی تێبگات کاتی دەداتێ هەتا وەڵام دەداتەوە ،پاشان پرسیارێکی تری ئاراستە دەکات. ) لەبەرامبەر ئەرك و ماندوبونتان سوپاس و پێزانینم هەیە بۆ سەرنج و بۆچونەکانتان.

ناوی مامۆستا: ........................ پلەی زانستی: .............................

پسپۆڕی: ............................. پسپۆڕی وورد:...............................

شوێنی کارکردن:.........................

خوێندکاری ماستەر سەرپەرشتیار

هێرۆ عبداللە حسین پ. د .نیان نامق صابر

## یەکەم: دەست پاکی وڕاستگۆیی (الامانەوالصدق)

| ژ | پرسیار | هەڵبژاردنی وەڵامی گونجاو | | هۆکار |
|---|---|---|---|---|
| 1 | ئەگەر پەرداخێکت شکاند لێیان پرسیت کێ شکاندی ،چی دەڵێیت ؟ بۆچی؟ | ڕاستی دەڵێیت | دەڵێیت نازانم | |
| 2 | ئەگەر لەباخچە قەڵەمێکت دۆزییەوە چیلێدەکەیت ؟ بۆچی؟ | دەیدەیتە مامۆستا | هەڵیدەگریت بۆخۆت | |
| 3 | ئەگەر براکەت لە منداڵەکە ی دا لێیان پرسیت کێ لێی دا چی دەڵێیت ؟ بۆ چی ؟ | براکەم لێی دا | نازانم | |
| 4 | ئەگەرهاوڕێکەت یارییەکی لا بەجێهێشتی چیلێدەکەیت؟ بۆچی؟ | بۆیدەگەڕێنیتەوە | دەیبەیت بۆ خۆت | |
| 5 | ئەگەر یاری هاوڕێکەتت شکاند چی پێدەڵێیت ؟بۆچی ؟ | ببورە نەمزانی | من نەمشکاندووە | |

## دووەم: یارمەتی و هەروەرزی (المساعدة و التعاون)

| ژ | پرسیار | هەڵبژاردنی وەڵامی گونجاو | | هۆکار |
|---|---|---|---|---|
| 1 | ئەگەر کەسێك پێویستی بەیارمەتی تۆ بو چیدەکەیت ؟بۆچی ؟ | یارمەتی دەدەیت | یارمەتی نادەیت | |
| 2 | ئەگەر مامۆستاو هاوڕێکانت بەهەرەوەزی کورسییەکان ڕێکبخەن تۆ چیدەکەیت؟بۆچی؟ | بەشداری دەکەیت | بەشداری ناکەیت | |
| 3 | ئەگەر ببینی منداڵێك کەوتووە چیدەکەیت؟بۆچی؟ | یارمەتی دەدەیت هەستێتەوە | بەجێیدەهێڵیت | |
| 4 | ئەگەر نابینایەکت بینی نەیتوانی لە شەقامەکە بپەڕێتەوە چیدەکەیت؟ | یارمەتی دەدەیت | یارمەتی نادەیت | |

## سێیەم: گوێڕایەڵی و پابەندبون بە سیستم الطاعة والألتزام بالنظام)

| ژ | پرسیار | هەڵبژاردنی وەڵامی گونجاو | | هۆکار |
|---|---|---|---|---|
| 1 | کاتی نان خواردن لەباخچە چۆن دەڕۆیت نانەکەت بخۆیت ؟بۆچی؟ | بەریز دەڕۆیت | لەریز لادەدەیت | |
| 2 | کاتێك کە مامۆستا وانەت بۆ ڕوندەکاتە پێویستە چیبکەیت؟ بۆچی؟ | گوێی لێدەگریت | قسەلەگەڵ هاوڕێکەت دەکەیت | |
| 3 | کاتی پەڕینەوە لەشەقام بەکوێدا دەڕۆیت ؟بۆچی؟ | بەسەرهێڵی پەڕینەوەدا | هەرشوێنێ کبێت | |

## چوارەم: میهرەبانی و هەستکردن بە بەرپرسیارێتی (المودة والأحساس بالمسؤولية)

| ژ | پرسیار | هەڵبژاردنی گونجاو | | هۆکار |
|---|---|---|---|---|
| 1 | دوای تەواوبون لە لە یاریکردن یارییەکان چیلێدەکەیت ؟بۆ چی ؟ | کۆیدەکەیتە وە | بەبڵاوکراوەی بەجێی دەهێڵیت | |
| 2 | ئەگەر سەردانی باخچەی ئاژەڵان بکەیت  چیدەکەیت ؟بۆچی؟ | ئازاریان نادەیت | ئازاریان دەدەیت | |
| 3 | ئەگەر بینیت بەلوعەیەك کراوەتەوە چیدەکەیت؟ بۆچی ؟ | دەیگریتەوە | وازیلێدەهێن یت بڕوات | |
| 4 | ئەگەر لەژوورەکەت بڕۆیتە دەرەوە  چیدەکەیت ؟وە بۆچی ؟ | گلۆپەکان دەکوژێنمە وە | بە هەڵکراوەیی جێی دەهێڵم | |

**پێنجەم: پارێزگاریکردن لە کەلوپەلە گشتی وتایبەتەکان (المحافقه على الممتلكات العامة والخاصة)**

| ژ | پرسیار | هەڵبژاردنی وەڵامی گونجاو | | هۆکار |
|---|---|---|---|---|
| 1 | منداڵێك لقی درەختێك دەشکێنێتەوە چی دەڵێیت؟ بۆچی؟ | هەڵەیە مەیشکێنەوە | هیچ ناڵێیت | |
| 2 | چی بە هاوڕێکەت دەڵێیت کە بەرد هەڵدەدات بۆ گڵۆپی سەر شەقامەکان و دەیانشکێنێت ؟ بۆچی؟ | کارێکی خراپە | هیچ ناڵێیت | |
| 3 | ئەگەر منداڵێك دەبەی ئاولەسەر شەقام فڕێبدات چی پێدەڵێیت؟بۆچی؟ | پێویستەبیخەیتە سەتڵی خۆڵەوە | هبچ ناڵێیت | |
| 4 | کاتێ سەردانی شاری یاری دەکەیت یارییەکان چی لێدەکەیت؟ بۆچی ؟ | دەیپارێزیت | دەیانشکێنیت | |

## پاشکۆی (4) ناوی شارەزایان بۆ دەرکردنی ڕاستگۆیی پێوەرەکە

| ژمارە | ناوی پسپۆڕان | پسپۆڕی | نازناوی زانستی | شوێنی کارکردن |
|---|---|---|---|---|
| 1 | د.سولاف فائق محمد علی | ڕێگاکانی وانەوتنەوەی زیندەوەرزانی | پرۆفیسۆر | زانکۆی سلێمانی |
| 2 | د.کەریم شەریف قەرەچەتانی | دەرونزانی گەشە | پرۆفیسۆر | زانکۆی سلێمانی |
| 3 | د.ايناس احمد عزيم | دەڕونزانی ئیکلینیکی | پرۆفیسۆری یاریدەدەر | زانکۆی سلێمانی |
| 4 | د.عبدالصمد احمد محمد | دەڕونناسی | پرۆفیسۆری یاریدەدەر | زانکۆی سلێمانی |
| 5 | د.کريم احمد عزيز | ڕێگاکانی وانەوتنەوەی کۆمەڵایەتی | پرۆفیسۆری یاریدەدەر | زانکۆی گەرمیان |
| 6 | د.فاضل عباس قاسم | ڕێگاکانی وانەوتنەوەی عەرەبی | پرۆفیسۆری یاریدەدەر | زانکۆی گەرمیان |
| 7 | د. سرمد صلاح محی الدين | فەلسەفەی پەروەردەیی | پرۆفیسۆری یاریدەدەر | زانکۆی گەرمیان |
| 8 | د.نزيره صالح محمد | پەروەردەی تایبەت | پرۆفیسۆری یاریدەدەر | زانکۆی سلێمانی |
| 9 | م.محمود حمه کريم محمود | دەڕونزانی پەروەردەیی | مامۆستا | زانکۆی گەرمیان |

## پاشکۆی (5) ڕاپرسی شارەزایان لەسەر ناوەڕۆکی چیرۆکەکان

وەزارەتی خوێندنی باڵاوتوێژینەوەی زانستی

زانکۆی سلێمانی

کۆلێجی پەروەدەی بنەڕەت

بەشی باخچەی منداڵان

خوێندنی باڵا/ماستەر

مامۆستای بەڕێز.........................

پاش ڕێزوسڵاو..........

توێژەر هەڵدەستێت بە ئەنجامدانی توێژینەوەیەك بە ناونیشانی (**کاریگەری چیرۆك لە گەشەپێدانی بەها ئاکارییەکان لای منداڵانی باخچە**) وەك یەكێك لە پێداویستییەکانی توێژینەوەکە توێژەر هەستاوە بە ئامادەکردنی (7) چیرۆك کە هاوپێچ کراوە بەشێوەی کتێب لەگەڵ ئەم ڕاپرسییەدا توێژەر بەگرنگی دەزانێت ڕاو بۆچونی بەڕێزتان وەر بگرێت وەك پسپۆڕو شارەزایەك لەو بارەوە لە ڕێگای وەڵامدانەوەی تەوەرەکانی ڕاپرسییەکەوە، هاوکاریتان جێگەی ڕێزو پێزانینە.

ناوی مامۆستا:................................... پلەی زانستی: ........................

پسپۆڕی:...................................... پسپۆڕی وورد:......................

شوێنی کارکردن:.................

سەرپەرشتیار — خوێندکاری ماستەر

پ.د.نیان نامق صابر — هێرۆ عبداللەحسین

| چیرۆكەكان | ژ | بڕگەكان | گونجاوە | نەگونجاوە | تێبینی |
|---|---|---|---|---|---|
| ڕاستگۆی و دەستپاكی | 1 | ناوە ڕۆكی چیرۆكەكە بۆمنداڵانی قۆناغی باخچە | | | |
| | 2 | لەڕوی وێنەوڕەنگەكانەوە | | | |
| | 3 | لەڕوی گەشەپێدان وناساندنی بەها ئاكارییەكانەوە | | | |
| | 4 | لەگەڵ توانای ژیری و تێگەیشتنی منداڵانی قۆناغی باخچە | | | |
| | 5 | وشەكانی بۆ منداڵانی قۆناغی باخچە | | | |
| یارمەتی و هەرەوەزی | 1 | ناوە ڕۆكی چیرۆكەكە بۆمنداڵانی قۆناغی باخچە | | | |
| | 2 | لەڕوی وێنەوڕەنگەكانەوە | | | |
| | 3 | لەڕوی گەشەپێدان وناساندنی بەها ئاكارییەكانەوە | | | |
| | 4 | لەگەڵ توانای ژیری و تێگەیشتنی منداڵانی قۆناغی باخچە | | | |
| | 5 | وشەكانی بۆ منداڵانی قۆناغی باخچە | | | |
| گوێڕایەڵی و پابەندبون بەسیستەم | 1 | ناوە ؤكی چیرۆكەكەبۆمنداڵانی قۆناغی ڕباخچە | | | |
| | 2 | لەڕوی وێنەوڕەنگەكانەوە | | | |
| | 3 | لەڕوی گەشەپێدان وناساندنی بەها ئاكارییەكانەوە | | | |
| | 4 | لەگەڵ توانای ژیری و تێگەیشتنی منداڵانی قۆناغی باخچە | | | |
| | 5 | وشەكانی بۆ منداڵانی قۆناغی باخچە | | | |
| میهرەبانی وهەستكردن بە بەرپرسیارییەتی | 1 | ناوە ؤكی چیرۆكەكەبۆمنداڵانی قۆناغی باخچە | | | |
| | 2 | لەڕوی وێنەوڕەنگەكانەوە | | | |
| | 3 | لەڕوی گەشەپێدان وناساندنی بەها ئاكارییەكانەوە | | | |
| | 4 | لەگەڵ توانای ژیری و تێگەیشتنی منداڵانی قۆناغی باخچە | | | |
| | 5 | وشەكانی بۆ منداڵانی قۆناغی باخچە | | | |
| پارێزگاریكردن لە | 1 | ناوە ؤكی چیرۆكەكەبۆمنداڵانی قۆناغی | | | |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| کەلوپەلە گشتی و تایبەتەکان | | باخچە | | | |
| | 2 | لەڕوی وێنەوڕەنگەکانەوە | | | |
| | 3 | لەڕوی گەشەپێدان وناساندنی بەها ئاکارییەکانەوە | | | |
| | 4 | لەگەڵ توانای ژیری و تێگەیشتنی منداڵانی قۆناغی باخچە | | | |
| | 5 | وشەکانی بۆ منداڵانی قۆناغی باخچە | | | |

## پاشكۆی (6) چیرۆكەكان



### یەكەم: ورچەكەی لیلی

لیلي كچێكی ژیرو خۆشەویست بو، ڕۆژانە لە كاروباری ماڵەوەدا هاوكاریی دایكی دەكردو دایكیشی دیاری جوانی بۆ دەكڕی، ڕۆژێك دایكی ورچێكی جوان و نەرمونۆڵی بۆ لیلي كڕی، لیلي بەو دیارییە زۆر دڵخۆش بو، ناوی لە ورچەكەی نا بێری.

لیلي بە شێوەیەك ورچەكەی خۆش دەویست كە بۆ هەر جێگەیەك بڕۆیشتایە لەگەڵ خۆیدا دەیبردو پاكوخاوێن رایدەگرت، ڕۆژانە بە یەكەوە یارییان دەكرد و شەوانیش لەلای خۆیەوە دەیخەواند، تاوەكو خەوی ناخۆشی بینی نەترسێت، ئایا تۆش یارییەكانت وەكو لیلي خۆش دەوێت؟

### دووەم: فیلی بچوكی لە خۆبایی



ڕۆژێك لە ڕۆژان فیلێكی بچووك، لەگەڵ دایكیدا لە ناو دارستانێكی نزیك لادێیەكدا دەژیان، فیلی بچووك زۆر لە خۆبایی بو، هەمیشە باسی ئازایەتی خۆی دەكرد، لەبەرئەوە ئاژەڵانی ناو دارستان كەم كەم لێی دور دەكەوتنەوە و ئیدی كەسی دەست نەكەوت بیكات بە هاوڕێی خۆی و ڕۆژێك دایكی ئەوی بە تەنها لە ماڵەوە بەجێهێشت و پێیوت: كە بۆ خۆی بە تەنها لە ماڵەوە یاری بكات

و نەچێتە دەرەوە، بەڵام فیلەکە بەگوێی دایکی نەکرد و ڕۆشت بۆ نـاو دارسـتان، فیلـی بچـووك بڕیاریدا بچێت بۆ ناو ئاژەڵان و یارییان لەگەڵ بکات، بەڵام ئاژەڵەکان ڕێگەیان نـەدا و ناچاریـان کرد دوربکەوێتەوەو فیلەکە وتی: زۆر باشە ئەڕۆم. ڕۆشت بەرەو ڕوبارەکە ئەو شوێنەی لەگـەڵ دایکی بۆ خۆشتن و یارکردن بۆی ئەچوون، بەڵام ڕێگاکە شارەزا نەبو، وون بو.

تا نزیکەی نیوەڕۆ بەرەو پێش ئەڕۆشت و بەخۆی ئەوت: ئێستا ئەگەمە روبارەکـە، بێ ئاگا لەوەی وون بوە و ڕێگەی ماڵەوە نازانێ، سەرگەردان بو کاتێك دەنگی خوڕەی ئاوەکـەی بیسـت، کاتیك تەماشای ماسییەکانی ئەکرد، لـەپڕ دارێـك نزیـك کەوتـەوە و دەسـتی پێـوەگرت و خـۆی ڕیگارکرد.



فیلـی بچـووك ئەوەنـدە مانـدوو بـو لـە کـەناری ڕوبارەکـە لێـی کـەوت، کاتێـك بـەئاگا هاتـەوە زۆری برسی بو تەماشەی دەوروبەری کرد، بەڵکو شـتێك بـۆ خـواردن بدۆزێتـەوە، لەوکاتـەدا ڕاوچییـەك تـۆڕێکی بەرەو ئەو هەڵداو گرتی، فیلەکە هەوڵی ئەدا خۆی لـە تۆڕەکـە ڕزگـار بکـات، بـەڵام نـەیتوانی، ڕاوچییەکـە فیلەکـەی خسـتە نـاو کیسـەیەکی گـەورە، لەوکاتـەدا ئاسکێك کە لەو ناوەدا ئەگەڕا سەرنجی ڕاوچییەکەی ڕاکێشاو ڕاوچییەکە فیلەکـەی خسـتە بـن دارێك و بڕیاریدا ئاسکەکە ڕاوبکات، ئاسکەکە ڕایدەکرد و لە فیلەکە دورکـەوتبوەوەو بـەزوویی ڕاوچییەکــە مانــدوو بــو دانیشــت، زۆر لــە فیلەکــە دورکەوتبوەوە، ئاسکەکە گەڕایـەوە بـۆ لای فیلەکـەو بـە هەر شێوەیەك بو ڕزگاریکرد، ئاسکەکە فیلەکەی بـردەوە بۆ ماڵەوە و چەند ڕۆژێك چاودێی کرد تا حاڵی باش بـو، ئاسکەکە لە فیلەکەی پرسی: چۆن بو کەوتیتە نـاو داوی ڕاوچییەکە؟ فیلەکـە بەسـەرهاتی ونبونەکـەی و ئـەوەی بەسەریهاتبو بۆی گێڕایەوە.



ئاسکەکە وتی: ئەو ڕۆژەی کە تۆ کەوتیتە ناو داوەکەوە من وەکو هەمیشە بەدوای خواردندا ئەگەڕام، کە لە پڕ ڕاوچییەکە تۆی خستە ناو داوەکەیەوەو بە خۆمم وت: ئەگەر ڕوچیەکە من ببینێ واز لە تۆ دێنێ، لەبەرئەوە خۆمم نیشانی ڕاوچیەکەدا و کاتێک ماندوو م کرد گەڕامەوە و تۆم ڕزگارکرد، فیلەکە لە فیداکاریی ئاسکەکە سوپاسی کردوو بڕیاریدا پاداشتی ئەو چاکەیەی بداتەوەو ڕۆشت لەگەڵ خۆیدا بیریکردەوە و وتی: پێویستە هەموو ئاژەڵانی ناو ارستان یارمەتی یەکتر بدەن.

هەر لەو کاتەدا کەروێشکێکی بچووکی بینی کە ونبوبو بەدوای دایکیدا ئەگەڕا، کەوتە بیری خۆی فرمێسک لە چاویدا قەتیس مابو بڕیاریدا یارمەتی بیدات، لەگەڵ کەروێشکە بچووکەکەدا بەدوای دایکیدا دەگەڕان، دایکی کەروێشک وتی من لێرم ئەی فیلی بەڕێز تکایە دارێک بێنەو لە تەڵەکە ڕزگارمکە، فیلەکە دارێکی درێژی بەلوتی گرت و کەم کەم بەوردی تەڵەکەی کردەوە توانی دایکە کەروێشک ڕزگار بکات، کەروێشکەکە خۆی هاویشتە باوەشی دایکی، فیلەکە حەزیکرد ئەویش دایکی بدۆزێتەوە.





ڕۆژێک لەگەڵ کەروێشکەکە ئەگەڕان، دووکەڵێکیان بینی لە دورەوە، بەرەو دووکەڵەکە ڕۆشتن بینییان کوخێک لەناو دارستانەکە ئاگری گرتووەو فیلەکە بە خەرتوومەکەی ئاوی هەڵمژی و ئەیکرد بە ئاگرەکەدا، کوخەکەیان کوژانەوە، ئاژەڵانێکی زۆری تریش بۆ کوژانەوەی ئاگرەکە هاتبون، فیلەکە لەناو ئاژەڵەکەندا دایکی خۆی دۆزینەوە، بەرەو ئەو ڕایکردو خۆی هاویشتە ئامێزی، دایکی وتی: ئێستا تۆ گەورەبوی لە بینینی کوڕەکەی خۆشحاڵ بو.

**سێیەم: دیاریەکەی نانسی**

بەیانیەکی درەوشاوەی خۆرەتاوبو، نانسی خۆی ئامادەکرد بۆ قوتابخانە، وەك هەمیشە تەواوی خێزانەکە بەدەوریدا دەهاتن و دەچوون، جلەکانیان بۆ ئامادەدەکرد، خواردنیان پێدەدا، پێڵاوەکانیان بۆ بۆیاخ دەکرد، جانتاکەیان بۆ ئامادەدەکرد، ژوورەکەیان بۆ پاك دەکردنەوە، لەگەڵ هەموو ئەو شتانەی پێویستە بۆ منداڵێك ئامادە بکرێت کە دەچێتە قوتابخانە.

نانسی تەنها منداڵی خێزانەکە بو، لەبەرئەوەی خێزانەکەی هەموو سەرنجێکیان لەسەر ئەو بو، نانسی وا ڕاهاتبو کە زۆر گرنگی پێبدرێت. جان باوکی نانسی بو، نانسی خێزا وەرە، سوپرایزم هەیە بۆت، نانسی بەرەو ڕوی باوکی ڕایکردو هاواریکرد، باوکە چییە؟ دادەکەی هاواریکرد: نانسی بۆینباخەکەت ئازیزەکەم، بەڵام نانسی هەر زوو لەبەرچاو نەما.

کاتێك چووە ژوورەکەی باوکی، باوکی جانتایەکی نوێی پێدا، نانسی وتی: واو جانتای نوێ، ئەوە ئەو جانتایەبو کە ئەو ڕۆژە بینیم، سوپاس باوکە، نانسی بۆ ئەو دیاریە جوانە بە توندی باوەشی کرد بە باوکیدا" باوکی وتی، زانیم کە حەزت لێی بو، لەبەرئەوەی بۆم کڕیت.

نانسی بە خێرایی پەرتووکەکانی خستە ناو جانتاکیەوە، نانسی وتی سوپاس دایکە، سوپاس باوکە، زوو ئەتانبینمەوە، پاشان ڕۆیشتە ناو ئۆتۆمبێلەکەوەو تاوەکو بۆ قوتابخانە دوانەکەوێت، کاتێك ویستی لەناو ئوتۆمبێلەکەدا دابنیشێت، نیڵ، کوری شۆفێرەکەی بینی کە لەماڵ هاتە دەر، ڕایکرد تاوەکو جانتا نوێیەکەی پیشانی نیڵ بدات، بەڵام وەستا کاتێك بینی جانتایەکی کارتۆنی لەدەستی نیڵدا بینی، نانسی پرسی، بۆچی پەرتووکەکانت لە ناو ئەو جانتا کارتۆنەدا هەڵگرتووە، کوا جانتاکەت، نیڵ وەڵامی دایەوە ژێر جانتاکەم دڕابو، باوکم ئەمڕۆ بۆم چاك دەکاتەوە، نانسی وتی، خولەکێك لێرەدا بوەستە، پاشان بەڕاکردن ڕۆیشتەوە ژوور.



نانسی پەرتووکەکانی لە جانتا نوێکەی دەرهێنا و کردییە ناو جانتا کۆنەکەیەوە، پاشان هەردوو جانتاکەی برد و ڕۆیشتە دەرەوە و جانتا نوێکەی دایە دەست نیڵ و وتی: ئەمە هەڵگرە

بۆ خۆت، من ئەم جانتا بەکار هاتووەتە نادەم بە تۆ، جانتا نوێکەت پێ دەدەم، نیڵ وتی: نـەخیر من ناتوانم ئەوە وەر بگرم.

لەو کاتە دا دایك و باوکی نانسی هاتنە دەر، جۆن وتی: وەریبگرە نیڵ وا داینێ کە دیارییـە، نیڵ تەماشایەکی باوکی کردو باوکیشی بەسەر لەقاندن ڕەزامەندی نوانـد کـە وەریبگرێـت، نیـڵ جانتاکەی وەرگت لـە نانسـی و یـەك یـەك پەرتوکـەکانی کـردە نـاوی و دەموچـاوی بەپێکەنـەوە دەدرەوشایەوە.

### چوارەم: هاوڕێی ڕاستەقینە



وەرزی بـــەهاربو، ڕۆنـــی زۆر بـــە پەرۆشـــبو کاتێك بەیانی لە خەوهەستا، خـۆی ئامـادەدەکرد بـــڕوات بـــۆ باخچـــەی ڕوەکناســـی وەك گەشـــتی قوتابخانـە، بـە خێرایـی نـانی بـەیانی خـــواردو کەلوپەلەکانی تایبەت بە گەشـتەکەی کـۆکردەوە، هـەر لەگـەڵ یەکـەم هـۆڕینی پاسـەکە، ڕۆنـی ڕایکردە دەرەوە و وتی: خوات لەگەڵ دایکە، خوات لەگەڵ باوکە، سوپاس کە ڕیگەتان پێدام کە یارییە ئەلیکترۆنیەکەم لەگەڵ خۆم ببەم، دەتانبینمەوە.



هـەموو منداڵـەکان لـەناو پاسـەکەدا زۆر بە پەرۆشبون، تـا گەیشـتنە باخچـەی ڕوەك ناسیەکە گۆرانییـان وت، هـەر زوو گەیشـتنە ئـەوێ، یـەکێك لـە مامۆسـتاکان وتـی: منداڵینـە، ئیتـر دەنـگ و ژاوەژاو تـەواو، بـەڕیز دابـەزن، بەمـەش خوێنـدکارەکان بۆیـان دەرکەوت گەیشتوونەتە شوێنی گەشتەکە، پاشان ڕۆنی و هاوڕێکانی لە پاسەکە دابەزین.

کاتژمێری یەکـەمی گەشـتەکە ناسـاندنی درەختـەکانی باخچەکـە بـو، پاشـان مامۆسـتاکان قوتابییەکانیان بردە شوێنی یاریکردنەکە تا کۆتایی ڕۆژەکـە پشـوو وەربگـرن، ڕۆنـی بەدەسـتی هێمای کرد بۆ ژێر دارێك و وتی: با بچین لەوێدا دابنیشین و یاری ئەلیکترۆنی بکەین، ڕۆمیۆ کە هاوڕیی نزیکی ڕۆنی بو وتی بەڵێ با ڕابکەین تا کەس جێگەکەی نەگرتووە.



هـــەموو منداڵـــەکان کـــاتێکی خۆشـیان بەسـەر بـردوو یارییـان دەکـرد تـا کـاتی ڕۆشـتنەوە هـات، کاتێـك شـۆفێری پاسـەکە هـۆڕنی لێـدا، هـەموو منداڵـەکان بـەرەو پاسەکە ڕایانکرد، لە پەلەپەلیدا بۆ ئەوەی زوو بچێتە نـاو پاسـەکە ڕۆنـی لـە بیـری چـوو یارییـە ئەلیکترۆنیـەکـەی بخانـە نـاو جانتاکەیـەوە، ڕۆمیـۆ تێبینـی ئـەوەی کـرد بـەبێ دەنگـی یارییـە ئەلیکترۆنیەکەی هەڵگرت و خستییە ناو جانتاکەی خۆیەوە، کاتێـك هـەموو منداڵـەکان سـواری پاسەکە بون، پاسەکە دەستیکرد بە ڕۆشـتن تـاوەکو منداڵـەکان بگەیەنێتـەوە بـەردەرگای مـاڵی خۆیان.



هـــەمووان لـــە پاســـەکەدا خۆشحاڵ بون، جگـە لـە ڕۆمیـۆ کـە شـپرزەو تـرس بـە ڕوخسـارییەوە دیاربو، ڕۆنی پرسی: چـی ڕویـداوە، هەست بە باشی ناکەیت، ڕۆمیۆ کە دەیویست دڵەڕاوکێکەی بشارێتەوە وەڵامی دایەوە: هەست بە سەرئێشـە دەکـەم، ڕۆنـی وتـی ڕێگەمبـدە سـەرت بـۆ بشـێلم، دواتـر هەست بە باشبون دەکەیت، ڕۆمیۆ تەماشایەکی ڕۆنی کرد کە چەند باشـە لەگەڵیـدا چاوەکـانی پڕبون لە فرمێسك.

ڕۆمیۆ بە گریانەوە وتی: داوای لێبوردەن ئەکەم ڕۆنی: تکایە بمبەخشە: هەموو قوتابییەکان ڕویان وەرگێڕاو تەماشای ڕۆمیۆیان کرد، مامۆستاکانی نـاو پاسـەکە لـە ڕۆمیـۆ نزیـك بونـەوە، ڕۆنـــی پرســـی بـــۆچی داوای لێبـــوردن دەکـــەیت؟ چ کارێکـــت کـــردووە؟ ڕۆمیـــۆ یارییـــە ئەلیکترۆنیـەکـەی دا بـە ڕۆنـی و وتـی: مـن یارییـە ئەلیکترۆنیـەکـەی تـۆم بـرد، تـۆ لـە باچـەی ڕوەکناسییەکە لە بیرتچوو، منیش لە بری ئەوەی بۆت بگەڕێنمەوە، لەناو جانتاکەمدا هەڵمگرت.

مامۆستا وتی: ڕۆمیۆ تۆ کوڕێکی ڕاستگۆیت هەموومان هەندێکجار کاری هەڵە دەکەین، بەڵام کەم کەس لە ئێمە ئازایانە دان بە هەڵەکەیدا دەنێت، ڕۆنی باوەشی بە ڕۆمیۆدا کردو وتی: خۆشحاڵم کە تۆ ئەو ئازایەتییەت تێدیەو هاوڕێی منیت، مامۆستاکان دەستیان هێنا بەسەری ڕۆنی و ڕۆمیۆدا و هەموو قوتابییەکانیش چەپڵەیان بۆ لێدان.

**پێنجەم: خەڵاتەکە**



ترینگگـــگ .. زەنگـــی پشـــو لێیـــدا، سـەرجەم منداڵـەکان پۆلـەکانیان چـۆڵکرد، هەندێك بە مەبەستی یـاریکردن، هەنـدێك بـــۆ نـــانخواردن و هەندێکیشـــیان بـــۆ پیاسەکردن لەگەڵ هاوڕێکانیان، جۆن ئـەو بەیانیە نـانی بـەیانی نـەخواردبو، هەستی بـە برسـێتیەکی زۆر دەکـرد و لەبەرئـەوەی دایك و باوکیشی لە ماڵ نەبو، هیچ خواردنێکی لەگەڵ خۆیدا نەهێنابوو بە خۆی وت: با بچم بۆ کافتریاکە، بەڕێکەوت بەرەو قەرەباڵغترین شوێنی قوتابخانەکە.



هەروەك ئەوەی بیری لێکردبووەوە ڕیـزی کافتریاکــە زۆر درێـــژ بـــو، لەبەرئـــەوەی هەڵبژاردەیـــەکی دیکـەی نـەبـو، بڕیاریـدا چـاوەڕی بکـات، لـەو کاتـەدا قوتابییـەکی گەوترە بو کە ناوی جەیك بو، لەگەڵ هاوڕێ کوڕەکانیدا بەرەو ڕیزکە هاتن نـۆرە بڕییـان کرد.

چەند دوو کوڕەکە گازەندەیان کرد بەڵام جەیك سـەیرێکی کـردن و داوای کێکـی لـە پیـاوی پشت کەوانتەرەکە کرد، پیاوەکە چەند کێکێکـی پێدان، یـەکێـك لـە هاوڕێکـانی جـەیك گلـەیی



لەوەکرد کە کێکەکان ساردن، کوڕەکان داوای کێکێکی گەرمیان کرد، بەڵام پێیانوتر کە تەنها ئەو جۆرە لە کافتریا هەیە.

جەیك وتی: کیشە نیە بیخۆن، هەمووان هەمان شت دەخۆن، هاوڕێکانی دەستیانکرد بە خواردنی کێکەکە بە دەنگێکی بەرز و گاڵتەیان بە کوڕەکانی دیکە دەکرد، گەدەی جۆن قوڕەی دەهات لە برسێتیدا، بەڵام ئەو هیشتا وەستا بو چاوەڕێی دەرد نۆرەی بێت.

کاتێك نۆرە گەیشتە سەر جۆن کێکەکان تەواو بون، ویستی بە دڵگرانیەوە بڕوان، بەڵام پیاوی پشت کاونتەرەکە وەستاندی، جۆن بوەتە، من هەر لەئێستادا چەند کێکێکی نوێی گەرمم بە دەست گەیشتن، دوای خولەکێك بە دوو کیکی فرێش و پەرداخێك شەربەتەوە گەڕایەوە لای جۆن.



لەکاتێکدا جۆن خواردنەکەی بە دەستەوە گرت، بۆنی کێکی فرێش هەموو شوێنێکی گرتەوە، جەیك و هاوڕێکانی بە تووڕەییەوە وەستابون و سەیری ئەو خوێندکارانەیان دەکرد کە لەبەرئەوەی بە ئارامگرییەوە لە ڕیزەکەیاندا وەستابون کێکی گەرمیان وەردەگرت.

### شەشەم: پێنووسە ونبوەکە

شاد دواکەوت و لەکاتی ڕۆشتنی بۆ قوتابخانە بەخێرایی بەسەر پلیکانەکاندا ڕایکرد، بۆئەوەی بگا بە پاسەکە. شاد تیانووس و پەرتوکی بیرکاریەکەی دەرهێنا لە پۆلدا، بەڵام پێنووسەکەی دیار نەبو، بە باشی ناو جانتاکەی گەڕا، بەڵام نەیدۆزینەوە، لەناخی خۆیدا وتی: ڕەنگە بەهۆی ئەوەی زۆر بە پەلە هاتمە دەرەوە لە ماڵەوە لە بیرمکردبێت، لە کاتی پشوودا شاد



بــە بێــزاری ڕۆشــتە گۆڕەپانەکــە. لەکاتێکــدا دەڕۆشــت پێنووســێکی بینــی لەســەر زەوی کەوتبو، هەڵیگرت و لە ناخی خۆیدا وتی: ئەمە لە بەختی باشی خۆمە، ئەم پێنووسە لـە بری ئەوەی لەبیرم کرد.

شاد زۆر دڵی خۆش بـو بـەو پێنووسـە، بـە ناو ڕێڕەوی قوتابخانەکەدا دەڕۆشـت، پاکـەتی شتە دۆزراوەکانی بەرچاو کەوت، ئـەو پاکەتـە بو هەر شتێك بدۆزرایەتەوە لـەوێ دیـان دەنـا، شاد بیریکردەوە، ئایا پێنووسەکەی تـێ بکـەم، ڕەنگە خاوەنەکەی بێت بۆی، یاخود داینەنێم؟

لە کۆتایدا شاد بڕوای بە خۆی هێنا زۆر پێویستی بەو پێنووسەیە، ئەگـەر خـاوەنی هـەبێت دەردەکەویت و هەواڵی دەپرسێت بۆی دابنێم.

شاد ڕۆیشت بۆ پۆل و پەرتوکی زانستی دەرهێنا، بەڵام هێشتا هەر بیری لای پێنووسەکەبو، کاتێك مامۆستا بینی شاد گوێ بۆ وانەکە ناگرێت پێـی وت: شـاد بیـر لـە چـی دەکەیتـەوە: شاد تۆزێــــك دوودڵ بــــو، لــــە وەڵامدانـــەوەدا، لـــە کۆتایـــدا ڕاســـتیەکەی وت: مامۆســـتا مـــن پێنووسەکەم لە ماڵەوە بیرچووبو، بەڵام ئەم پێنووسەم دۆزییەو، هـی مـن نیـە، ئـەتوانم بیگەڕێنمـەوە بـۆ پاکەی شتە دۆزراوەکان؟



مامۆســـتا بـــە دۆڵخۆشـــییەوە وتـــی: ئەمـــە لای تـــۆ وەك

ئەسپاردەیەك وایە، بەڵێ فەرموو، شاد لە پۆلەکەی ڕۆشتە دەرەوە، مامۆستا وەستا لە درێژەدان بە شەرحی وانەکە تا دەگەڕێتەوە، کەمتر لە دووخولەکی پێنەچوو بە دڵخۆشی گەڕایەوە، وتی مامۆستا بڕوا ناکەیت چی ڕویدا، لە پاکەتی دۆزراوەکاندا پێنووسەکەم دانرابو، دیارە کەسێك دۆزیویەتییەوە و لەوێ داینـاوە.

**حەوتەم: هەرگیز ئازاری گیانلەبەران مەدە**



ئارۆ لەگەڵ دایك و باوکی و نازی خوشکی بۆ پیاسە ڕۆشتنە باخچەی ئاژەڵان، ڕۆیکی خۆش بو، ئاسمان ساماڵ بو، شنەبایەکی خۆشی هەبو، ئارۆ لەبەردەم قەفەسی مەیمونەکە وەستا، هەدێك بەردی لە گیرفانی دەرهێنا.

باوکی ئاگای لێ نەبو، بەردەکانی دەگرتە مەیمونەکە، بە هاواری مەیمونەکە پێدەکەنی، بەڵام ناز ئەوەی بین، پێی وت، ئازاری ئەو مەیمونە مەدە، پێویستە سۆزت بۆی هەبێت، بەڵام ئارۆ پێیوت: من حەزم لە یاریکردنە لەگەڵیدا، ناز وتی، ئەگەر دووبارەی بکەیتەوە بە باوکم دەڵێم.



کە ناز ڕۆشت ئارۆ لەدواوە زمانی لێ دەردەهێنا و چەند بەردێکی دیکەی گرتە مەیمونەکە، کاتێك ئارۆ ڕۆشت بۆ خانەی فیلەکان سواری پشتی فیلەکە بو، بە قنەپاژنەی قۆندەرەکەیدەیدا لە فیلەکە، فیلەکەش لوتی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و لەتاوا هاواریدەکرد، هیچ کەسێك نیدەزانی بۆچی وەها دەکات جگە لە ئارۆ ئەویش پێیپێدەکەنی.

خێزانەکە لە خانەی فیلەکان دەرچوون، ڕۆیشتن بۆ بینینی زەڕافە، پاسەوانەکە دارێکی پێبو خواردنی پێدەدا، ئارۆ وتی باوکە ئەتوانم هەندێك خواردنی پێ بدەم، باوکی وتی بەڵێ کورم، ئارۆ ئەو دارەی پاسەوانەکە خواردنی بە زەرافەکە دەدا وەریگرت، بردی بۆ دەمی زەڕافەکە کە دەمیکردەوە دەیکرد بە دەمیدا و توندی دای لەلایەکی دەمی زەڕافەکە، کاتێك پاسەوانەکە ئەمەی بینی دارەکەی لە ئارۆ وەرگرت و بە تورەییەوە وتی: نابێت توند و تیژی لەگەڵ ئاژەڵان بنوێنیت.



باوکی ئارۆ داوای لێبوردنی لە پاسەوانەکە کرد و پاشان ڕۆشتن بۆ لانەی دۆلفینەکان، لەو کاتە دا ئارۆ کەوتە ناو ئاوەکە، دایك و خوشکی ئارۆ دەستیان کرد بە هاوار هاوار، چونکە هیچ کەسیان مەلەیان نەدەزانی، نەك هەر ئەوان هیچ کەسێك لە خێزانەکەی مەلەی نەدەزانی.

بەڵام پێش ئەوەی کەسیك بێت بە هانایەوە و ڕزگاری بکات، یەکێك لە دۆلفینەکان ئارۆی بەرزکردەوە تا ئەو کاتەی پاسەوانێك هات و ئارۆی ڕزگارکرد، ناز وتی: ئەو ئاژەڵانەی تۆ ئازارت دەدان ڕزگاریان کردیت، پێویستە هەمیشە بە سۆز بین بەرامبەر بە ئاژەڵان و ئازاریان نەدەین.

## پاشکۆی (7) ناوی شارەزایان بۆ چیرۆکەکان

| ژمارە | ناوی پسپۆڕان | پسپۆڕی | نازناوی زانستی | شوێنی کارکردن |
|---|---|---|---|---|
| 1 | د.سولاف فائق محمد علی | ڕێگاکانی وانەوتنەوەی زیندەوەرزانی | پرۆفیسۆر | زانکۆی سلێمانی |
| 2 | د.کەریم شەریف قەرەچەتانی | دەرونزانی گەشە | پرۆفیسۆر | زانکۆی سلێمانی |
| 3 | د.ایناس احمد عزیم | دەڕونزانی کلینیکی | پرۆفیسۆری یاریدەدەر | زانکۆی سلێمانی |
| 4 | د.عبدالصمد احمد محمد | دەڕوونناسی | پرۆفیسۆری یاریدەدەر | زانکۆی سلێمانی |
| 5 | د. نظام عبدالجبار | فەلسەفەی پەروەردە | پرۆفیسۆری یاریدەدەر | زانکۆی زانکۆی سلێمانی |
| 6 | د.نزیرە صالح محمد | پەروەردەی تایبەت | پرۆفیسۆری یاریدەدەر | زانکۆی سلێمانی |
| 7 | د. وەفا محمد حسین | ڕێگەکانی وانەوتنەوەی هونەر | پرۆفیسۆری یاریدەدەر | زانکۆی سلێمانی |
| 8 | د. گێلاس عبداللە اسماعیل | دەرونزانی | مامۆستا | زانکۆی سلێمانی |
| 9 | م.ی شنۆ دەروێش محمد | ڕیگاکانی وانەوتنەوە | م. یاریدەدەر | زانکۆی سلێمانی |

## پاشکۆی (8) پلانی وتنەوەی وانەی چیرۆك بۆ گروپی ئەزموونی

### پلانی یەکەم

ناونیشانی بەها: دەستپاکی — ناوی چیرۆك: پێنووسە ونبوەکە

ژووری: هەرمێ: — وانەی: سێیەم

ڕێکەوت: 2022/4/3 / یەك شەممە — کات: 30 خولەك

| پێشەکی | ئامانجی تایبەتی | ئامانجی ڕەفتاری | ئامرازەکانی فێرکردن | خستنەڕو | هەڵسەنگاندن |
|---|---|---|---|---|---|
| (5) خولەك دوای چوونەژوورەوە و سڵاوکردن لە منداڵان، ڕێکخستنی کورسی و چۆنیەتی دانیشتنیان و ئامادەکردنیان بۆ وانەی ئەمڕۆ و وەبیرهێنانەوەی وانەی پێشوو | پێدانی چەند زانیارییەکی گرنگ لەسەر بەهای دەستپاکی و گەشەپێدانی بەهای دەستپاکی لەڕێگەی چیرۆکەکەوە | منداڵ بتوانێت ناوی ئەو بەهایانە بڵێت کە لەناو چیرۆکەکەدا باسمانکرد ، هەروەها ناوی ئەو کەسایەتیانەی کە لەناو چیرۆکەکەدا بەشداربون و کامیان خەسڵەتی بەهای دەستپاکی تێدایە. | پیشاندانی وێنەی ناو چیرۆکەکان و فلاشکارت و دەنگ گۆڕین | (20) خولەك پێشکەشکردنی چیرۆکەکە کە باس لە بەهای دەستپاکی دەکات. بە بەکارهێنانی ئامرازەکانی فێرکردن چیرۆکەکان بۆ منداڵان دەخەمەڕو. پاشان بۆ منداڵەکانی ڕوندەکەمەوە کە بەهای دەستپاکی بۆ مرۆڤ چەندە گرنگە. پاشان بەڕێگەی دووبارەکردنەوەی ڕۆڵی کەسایەتییەکانی ناو چیرۆکەکە ڕۆڵ بە منداڵەکان دەدەم تا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەرجەستەی بەهای دەستپاکی بکەن. | (5) خولەك پرسیار لە منداڵەکان دەکەم بەم شێوەیە: ناوی ئەو کەسایەتیانە بڵێ کە لە چیرۆکەکەدا ڕۆڵیان بینیوە. ئەگەر شتێك بدۆزیتەوە چی لێ دەکەیت. لە کۆتایدا (شاد) قەڵەمەکەی چی لێکرد. چی لەم چیرۆکەوە فێربویت؟ |

**پلانی دووەم**

ناونیشانی بەها: یارمەتی و هەروەرزی — ناوی چیرۆك: فیلی بچووکی لە خۆبایی

ژووری: هەرمێ — وانەی: سێیەم

ڕێکەوت: 2022/4/4 / دوو شەممە — کات: 30 خولەك

| پێشەکی | ئامانجی تایبەتی | ئامانجی ڕەفتاری | ئامرازەکانی فێرکردن | خستنەڕو | هەڵسەنگاندن |
|---|---|---|---|---|---|
| (5) خولەك دوای چوونەژوورەوە و سڵاوکردن لە منداڵان، ڕێکخستنی کورسی و چۆنیەتی دانیشتنیان و ئامادەکردنیان بۆ وانەی ئەمڕۆ و وەبیرهێنانەوەی وانەی پێشوو | پێدانی زانیاریی لەسەر بەهای یارمەتیدان و هەروەرزی کەسانی دەوروبەر لەڕێگەی چیرۆکەکەوە | منداڵ بتوانێت ناوی ئەو بەهایانە بڵێت کە لەناو چیرۆکەکەدا باسمانکرد ، هەروەها ناوی ئەو کەسایەتیانەی کە لەناو چیرۆکەکەدا بەشداربون و کامیان خەسڵەتی بەهای یارمەتی و هەروەزییان تێدایە. | پیشاندانی وێنەی ناو چیرۆکەکان و فلاشکارت و دەنگ گۆڕین. ئاژەڵانی بەرجەستەی لە پەڕۆ و پلاستیك دروستکراو | (20) خولەك پێشکەشکردنی چیرۆکەکە کە باس لە بەهای یارمەتی و هەروەزی دەکات. بە بەکارهێنانی ئامرازەکانی فێرکردن چیرۆکەکان بۆ منداڵان دەخەمەڕو. پاشان بۆ منداڵەکانی ڕوندەکەمەوە کە بەهای یارمەتی و هەروەزی بۆ مرۆڤ چەندە گرنگە. پاشان بەڕێگەی دووبارەکردنەوەی ڕۆڵی کەسایەتییەکانی ناو چیرۆکەکە ڕۆڵ بە منداڵەکان دەدەم تا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەرجەستەی بەهای یارمەتی و هەرەوەزی بکەن. | (5) خولەك پرسیار لە منداڵەکان دەکەم بەم شێوەیە: کێن ئەو ئاژەڵانەی ڕۆڵیان هەبو لە چیرۆکەکەدا؟ ئایا فیلی بچووك بە قسەی دایکی کرد؟ چی بەسەرهات؟ ئاژەڵەکان یارمەتی فیلەکەیان دا؟ ناوی ئەو ئاژەڵە بڵێ کە یارمەتی فیلەکەی دا؟ ئاگرەکە چۆن کوژایەوە؟ |

**پلانی سێیەم**

ناونیشانی بەها: پابەندبون بە سیستم		ناوی چیرۆك: ئارامگرتن

ژووری: هەرمێ:		وانەی: سێیەم

ڕێکەوت: 2022/4/6 / چوار شەممە		کات: 30 خولەك

| پێشەکی | ئامانجی تایبەتی | ئامانجی ڕەفتاری | ئامرازەکانی فێرکردن | خستنەڕو | هەڵسەنگاندن |
|---|---|---|---|---|---|
| (5) خولەك دوای چوونەژوورەوە و سڵاوکردن لە منداڵان، ڕێکخستنی کورسی و چۆنیەتی دانیشتنیان و ئامادەکردنیان بۆ وانەی ئەمڕۆ و وەبیرهێنانەوەی وانەی پێشوو | پێدانی زانیاریی لەسەر بەهای پابەندبون بە سیستم لەڕێگەی چیرۆکەکەوە | منداڵ بتوانێت ناوی ئەو بەهایانە بڵێت کە لەناو چیرۆکەکەدا باسمانکرد ، هەروەها ناوی ئەو کەسایەتیانەی کە لەناو چیرۆکەکەدا بەشداربون و کامیان خەسڵەتی بەهای پابەندبون بە سیستمی تێدایە. | پیشاندانی وێنەی ناو چیرۆکەکان و فلاشکارت و دەنگ گۆڕین. | (20) خولەك پێشکەشکردنی چیرۆکەکە کە باس لە پابەندبون بە سیستم دەکات. بە بەکارهێنانی ئامرازەکانی فێرکردن چیرۆکەکان بۆ منداڵان دەخەمەڕو. پاشان بۆ منداڵەکانی روندەکەمەوە کە بەهای پابەندبون بە سیستم بۆ مرۆڤ چەندە گرنگە و پابەندبون بە سیستمی ئەو شوێنەی کە تێیدا دەژین پاشان بەڕێگەی دووبارەکردنەوەی ڕۆڵی کەسایەتییەکانی ناو چیرۆکەکە ڕۆڵ بە منداڵەکان دەدەم تا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەرجەستەی بەهای پابەندبون بە سیستم بکەن. | (5) خولەك پرسیار لە منداڵەکان دەکەم بەم شێوەیە: جەیك چیکر؟ ئایا کارێکی دروستی ئەنجامدا؟ جۆن لە ئەنجامی چاوەڕوانی و پابەندبون بە سیستم چی وەرگرت؟ |

## پلانی چوارەم

ناونیشانی بەها: میهرەبانی ناوی چیرۆك: هەرگیز ئازاری گیانلەبەران مەدە

ژووری: هەرمێ وانەی: سێیەم

ڕێکەوت: 2022/4/10 / یەك شەممە کات: 30 خولەك

| پێشەکی | ئامانجی تایبەتی | ئامانجی ڕەفتاری | ئامرازەکانی فێرکردن | خستنەڕو | هەڵسەنگاندن |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| (5) خولەك دوای چوونەژوورەوە و سڵاوکردن لە منداڵان، ڕێکخستنی کورسی و چۆنیەتی دانیشتنیان و ئامادەکردنیان بۆ وانەی ئەمڕۆ و وەبیرهێنانەوەی وانەی پێشوو | پێدانی زانیاریی لەسەر میهرەبانی و هەوڵدان بۆ چاندنی ئەم بەهایە لەناخی منداڵەکاندا لەڕێگەی چیرۆکەکەوە | منداڵ بتوانێت ناوی ئەو بەهایانە بڵێت کە لەناو چیرۆکەکەدا باسمانکرد ، هەروەها ناوی ئەو کەسایەتیانەی کە لەناو چیرۆکەکەدا بەشداربون و کامیان خەسڵەتی بەهای میهرەبانی تێدایە. | پیشاندانی وێنەی ناو چیرۆکەکان و فلاشکارت و دەنگ گۆڕین. نیشاندانی هەندێك ئاژەڵ کە لە پەڕۆ و پلاستیك دروستکراوون. | (20) خولەك پێشکەشکردنی چیرۆکەکە کە باس لە میهرەبانی دەکات بەرامبەر بە ئاژەڵان. بە بەکارهێنانی ئامرازەکانی فێرکردن چیرۆکەکان بۆ منداڵان دەخەمەڕو. پاشان بۆ منداڵەکانی ڕوندەکەمەوە کە بەهای میهرەبانی بۆ مرۆڤ چەندە گرنگە. لەڕێگەی پێدانی ڕۆڵ بە منداڵان، دووبارە بەهای میهرەبانی شرۆڤە دەکەینەوە. | (5) خولەك پرسیار لە منداڵەکان دەکەم بەم شێوەیە: ئارۆ لەگەڵ خێزانەکەیاندا ڕۆشتن بۆ کوێ؟ ئارۆ چی لە مەیموونەکان دەکرد؟ ئایا کارێکی دروستی ئەنجامدا؟ ئەگەر سەردانی باخچەی ئاژەڵان بکەن ئازاری ئاژەڵەکان دەدەن؟ بۆ دەبێت میهرەبان بین بەرامبەر بە ئاژەڵان. |

## پلانی پێنجەم

ناونیشانی بەها: پارێزگاریکردن لە کەلوپەلە گشتی و تایبەتەکان
ناوی چیرۆك: ورچەکەی لیلي

ژووری: هەرمێ
وانەی: سێیەم

ڕێکەوت: 2022/4/11 / دوو شەممە
کات: 30 خولەك

| پێشەکی | ئامانجی تایبەتی | ئامانجی ڕەفتاری | ئامرازەکانی فێرکردن | خستنەڕو | هەڵسەنگاندن |
|---|---|---|---|---|---|
| (5) خولەك دوای چوونەژوورەوە و سڵاوکردن لە منداڵان، ڕێکخستنی کورسی و چۆنیەتی دانیشتنیان و ئامادەکردنیان بۆ وانەی ئەمڕۆ و وەبیرهێنانەوەی وانەی پێشوو | پێدانی زانیاریی لەسەر بەهای پارێزگاریکردن لە کەلوپەلە گشتی و تایبەتەکان، بە ئامانجی گەیاندنی سوود بۆ منداڵانی باخچە، تا لەڕێگەی ئەم چیرۆکەوە فێربن لە شوێنە گشتی و تایبەتەکاندا کەلوپەلەکان بپارێزن. | منداڵ بتوانێت ناویکەسایەتییە سەرەکییەکانی ناو چیرۆکەکەکە بڵێن، لەگەڵ ناوی ئەو بەهایەی کە لەم چیرۆکەوە فێربون. | پیشاندانی وێنەی ناو چیرۆکەکان و فلاشکارت و دەنگ گۆڕین. ئاژەڵانی بەرجەستەی لە پەڕۆ و پلاستیك دروستکراو | (20) خولەك خستەنەڕوی چیرۆکەکە کە باس لە پارێزگاریکردن لە کەلوپەلە گشتی و تایبەتەکان، دەکات لەڕێگەی بینینی ڕۆڵی تایبەت بە کەسایەتییەکانی ناو چیرۆکەکە لەلایەن خۆمەوە، هەروەها کات دەدەم بە منداڵەکان بۆ ئەوەی خۆیان ڕۆڵی چیرۆکەکە بگێڕن. | (5) خولەك پرسیار لە منداڵان دەکەم لەبارەی چیرۆکەکەوە: ئایا دایکی لیلي چی بۆ کڕی؟ بێری چۆن مامەڵەی لەگەڵ ورچەکەی دەکرد؟ ئێوە کەلوپەل و یارییەکانتان دەپارێزن؟ |

**پلانی شەشەم**

ناونیشانی بەها: هەستکردن بە بەرپەرسیارێتی

ناوی چیرۆك: دیاریەکەی نانسی

ژووری: هەرمێ

وانەی: سێیەم

ڕێکەوت: 2022/4/13 / چوار شەممە

کات: 30 خولەك

| پێشەکی | ئامانجی تایبەتی | ئامانجی ڕەفتاری | ئامڕازەکانی فێرکردن | خستنەڕو | هەڵسەنگاندن |
|---|---|---|---|---|---|
| (5) خولەك دوای چوونەژوورەوە و سڵاوکردن لە منداڵان، ڕێکخستنی کورسی و چۆنیەتی دانیشتنیان و ئامادەکردنیان بۆ وانەی ئەمڕۆ و وەبیرهێنانەوەی وانەی پێشوو | پێدانی زانیاریی لەسەر بەهای هەستکردن بە بەرپرسیارێتی، هەوڵدەدەم لەڕیگەی ئەم چیرۆکەوە منداڵەکان زیاترفێری بەهاکە بکەم و هانیان بدەم لەسەر گرنگی ئەم بەهایە لە ژیانی ڕۆژانەیاندا. | منداڵەکان بتوانن ناوی چیرۆکەکەو کەسایەتییەکانی ناوی بڵێن، هەروەها بتوانن ئەوەش بخەنەڕو کە چیرۆکەکە باس لە چی دەکات. | پیشاندانی وێنەی ناو چیرۆکەکان و فلاشکارت و دەنگ گۆڕین. | (20) خولەك خستنەڕوی چیرۆکەکە کە باس لە هەستکردن بە بەرپرسیارێتی دەکات، چیرۆکەکەیان بۆ ڕوندەکەمەوە. منداڵەکان لەڕێگەی نواندنی ڕۆڵی کەسایەتییەکانەوە بەشداری چیرۆکەکەیان پێ دەکەم. | (5) خولەك پرسیار لە منداڵان دەکەم لەبارەی چیرۆکەکەوە: باوکی نانسی چی بۆ نانسی کڕی. هاوڕیکەی ناوی چی بو؟ نانسی هەستی بە چیکردن کاتێك بینی هاوڕێکەی جانتاکەی دڕاوە؟ |

## پلانی حەوتەم

ناونیشانی بەها: ڕاستگۆیی
ناوی چیرۆك: هاوڕێی ڕاستەقینە

ژووری: هەرمێ
وانەی: سێیەم

ڕێکەوت: 2022/4/17 / یەك شەممە
کات: 30 خولەك

| پێشەکی | ئامانجی تایبەتی | ئامانجی ڕەفتاری | ئامرازەکانی فێرکردن | خستنەڕو | هەڵسەنگاندن |
|---|---|---|---|---|---|
| (5) خولەك دوای چوونەژوورەوە و سڵاوکردن لە منداڵان، ڕێکخستنی کورسی و چۆنیەتی دانیشتنیان و ئامادەکردنیان بۆ وانەی ئەمڕۆ و وەبیرهێنانەوەی وانەی پێشوو | پێدانی زانیاریی لەسەر بەهای ڕاستگۆیی. لەڕێگەی ئەم چیرۆکەوە هەوڵدەدەم منداڵەکان ئاشنابکەم بە گرنگی ئەم بەهایە و کارپێکردنی لە ژیانی ڕۆژانەدا. | منداڵەکان بتوانن ناوی چیرۆکەکەو کەسایەتییەکانی ناوی بڵێن، هەروەها بتوانن ئەوەش بخەنەڕو کە چیرۆکەکە باس لە چی دەکات. | پیشاندانی وێنەی ناو چیرۆکەکان و فلاشکارت و دەنگ گۆڕین. | (20) خولەك ناوەڕۆکی چیرۆکەکە باس دەکەم کە باس لە ڕاستگۆیی دەکات، هانیان دەدەم کە هەمیشە ڕاستگۆبن . کاتیان پێدەدەم بە بینینی ڕۆڵی کەسایەتییەکانی ناو چیرۆکەکە، تا بتوانن بەباشی تێکەڵی ناو چیرۆکەکە ببن. | (5) خولەك پرسیار لە منداڵان دەکم لەبارەی چیرۆکەکەوە: ڕۆنی چی لەگەڵ خۆی برد بۆ گەشتەکە. ڕۆمیۆ یاریەکەی ڕۆنی چی لێکرد. ئایا لە کۆتایدا گەڕاندییەوە بۆی. هەستی بە چیکرد و مامۆستا چی بە ڕۆمیۆ وت؟ |

## پاشكۆی (9) پلانی وتنەوەی وانە بۆ گرووپی كۆنترۆڵكراو

### پلانی یەكەم

ناوی بابەت: یەكەی نیشتمانەكەم – بۆنەو جەژنەكان      ژووری: هەنار

وانەی: دووەم      كات: 30 خولەك

ڕێكەوت: 2022/4/3 /یەك شەممە

| پێشەكی | ئامانجی تایبەتی | ئامانجی ڕەفتاری | ئامرازەكانی فێركردن | خستنەڕو | هەڵسەنگاندن |
|---|---|---|---|---|---|
| (5) خولەك دوای چوونەژوورەوە و سڵاوكردن لە منداڵان، ڕێكخستنی كورسی و چۆنیەتی دانیشتنیان و ئامادەكردنیان بۆ وانەی ئەمڕۆ و وەبیرهێنانەوەی وانەی پێشوو | پێدانی چەند زانیارییەكی گرنگ لەسەر بۆنەو جەژنەكان | منداڵ بتوانێت گرنگترن ئەو بۆنەو جەژنانەی كە لە كۆمەڵگەدا هەیە بییانناسێتەوە و بیانژمێرێت. بۆ نموونە جەژنی نەتەوەیی نەورۆز لە هەردوو جەژنی ڕەمەزان و قوربان جیا بكاتەوە. | پیشاندانی وێنەی ناو چیرۆكەكان و فلاشكارت و دەنگ گۆڕین | (20) خولەك باسكردنی بۆنەو جەژنەكان، منداڵان ئاشنا دەكەم بە گرنگی ئەو بۆنەو جەژنانە لەڕوی كۆمەڵایەتییەوە. هەروەها دروستبونی ئەو پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەی كە بەهای جەژنەكانەوە دروست دەبێت لەنێوان تاكی كوردا، لەگەڵ ئەو بەها ئاكاریانەی كە پێویستە لە جەژنەكاندا بەرامبەر بە یەكتری ئەنجامی بدەین. | (5) خولەك پرسیار لە منداڵەكان دەكەم بەم شێوەیە: ناوی هەندێك لە بۆنەو جەژنەكان بڵێ؟ چی بكەین لە ڕۆژانی جەژن و بۆنەكاندا؟ چۆن مامەڵە لەگەڵ هاورێكانمان بكەین لە جەژنەكاندا؟ |

## پاشکۆی (10) وێنەی توێژەر لەکاتی جێبەجێکردنی ئەزموونەکەدا





**حكومة اقليم كوردستان - العراق**

**وزارة التعليم العالي والبحث العلمي**

**جامعة السلمانية**

**كليه التربيه الاساس**

**قسم رياض الاطفال**

# أثر القصص في تنمية القيم الأخلاقية لدى أطفال الرياض

رسالة مقدمة إلى مجلس كلية التربية الاساس بجامعة السليمانية ضمن

متطلبات نيل درجة الماجستير في رياض الأطفال

من قبل

**هێرۆ عبدالله حسين**

بأشراف

**پ.د. نيان نامق صابر**

2723 الكردى　　　　2023 الميلادي　　　　1444 الهجري

# ملخص البحث

يهدف البحث الى (معرفة تأثير سرد القصص في تنمية القيم الأخلاقية لدى أطفال الروضة، المستوى الثاني، أعمارهم تتراوح بين (5) سنوات، من اجل تحقيق هدف للبحث استخدمت الباحثة المنهج (التجريبي)، والذي يتناسب مع مضمون البحث، أداة البحث عبارة عن مقياس القيم الأخلاقية والمكون من (5) مجالات، و إعداد قصص خاصة بمجال القيم الأخلاقية والمكوّنة من (7) قصص. اما مجتمع البحث فهو عبارة عن أطفال الروضة، وبالنسبة لعيّنة البحث فهي عبارة عن (40) طفلاً من اطفال الروضة وتمّ تقسيمها الى مجموعتين: المجموعة التجريبية المكوّنة من (20) طفلاً والمجموعة الضابطة المكوّنة من (20) طفلاً ايضاً، استخدمت الباحثة واستخدمت الباحثة الأدوات الإحصائية (اختبار t)، ومعامل ارتباط بيرسون (One Way ANOVA)، (LSD) وتوصل إلى عدة استنتاجات هي:

1. الفرق بين مستويات معايير البحث للاختبار القبلي والبعدي واللاحق لمعايير المجموعة التجريبية فيما يتعلق بمجالات (النزاهة ، المساعدة ، الطاعة ، اللطف ، الحماية) هو لصالح الاختبار البعدي للقصص السردية في تنمية القيم لدى أطفال الروضة.
2. الفرق بين مستوى معايير البحث للاختبار القبلي والبعدي للمجموعة التجريبية في مجالات (النزاهة، المساعدة، الطاعة، اللطف، الحماية) لصالح الاختبار البعدي للقصة في التنمية. غرس القيم لدى أطفال الروضة.
3. لا يوجد فروق ذات دلالة إحصائية في القصة للمجموعة التجريبية في متغير العمر مما يدل على تطابقهم العمري بعد السرد في المجموعة التجريبية.
4. لا يوجد فرق إحصائي في القصة لصالح المجموعة التجريبية في متغير الترتيب الطفل في العائلة، مما يدل على ذلك من حيث ترتيب الأقران بعد السرد القصصي في المجموعة التجريبية.
5. لا يوجد فرق إحصائي في القصة لصالح المجموعة التجريبية في متغير الجنس مما يدل على أنهم متساوون بين الجنسين بعد سرد القصة في المجموعة التجريبية.
6. القصة تؤثر على القيم الأخلاقية لدى الأطفال بعد التجربة للمجموعة التجريبية.

# Abstrac

The aim of the research is to Identify the effect of storytelling on the development of moral values among kindergarten children aged 5 years .The researcher used an (exprimental) method to achieve the aim of her research, which is appropriate to the content of her research.The research tool is the moral values quetisnaine consists of (5) fields and the preparation of stories related to the field of moral values, which are (7) stories ,the study community consists of kindergarten children. The sample consists of (40) child divided into two groups: experimental group (20) child and control group (20) child.

The statistical tools, that used in like person correlation T-tes and Anova, included:

1. The difference between the level of research standards for the pre- and post-test of the experimental group in the areas of (integrity, assistance, obedience, kindness, protection) in favor of the post-test of the story in development. Instilling values in kindergarten children.
2. There are no statistically significant differences in the story for the experimental group regarding the age variable, which indicates their age matching after the narration in the experimental group.
3. There is no statistical difference in the story in favor of the experimental group in the ranking variable, which indicates this in terms of the ranking of peers after storytelling in the experimental group.
4. 4. There is no statistical difference in the story in favor of the experimental group in the variable of the child’s arrangement in the family, which indicates this in terms of the arrangement of peers after storytelling in the experimental group.
5. The story affects the moral values of children after the experiment for the experimental group.

Kurdistan Regional Government - Iraq
Ministry of Higher Education and Scientific Research
University of Sulaimani
College of Basic Education
Kindergarten Department

# The Impact of Stories on the Development of moral values amang Kindergarten

The Thesis submitted to the Council of the College of basic education at Sulaimani University as part of the requirements for obtaining a Master's degree in /Kindergarten

**BY:**
**Hero Abdulla Hussain**

**Supervised by:**
**Prof.Dr. Niyan Namiq Sabir**

**2724 k** **2023AD** **1444 AH**